# هێلکەی ئاڵتونی!







18
ساڵی دووەم
تشرینی دووەمی
2009


## دەتوانین!!

# توانای سەرکردایەتیکردنت هەیە؟

## یاساکانی فرۆشتن

## چۆن دەبیتە هاوسەرێکی نموونەیی؟

## چۆن بکەین بە ئاسودەیی‌و بەختەوەری؟

قوربان! قوربانەن، جەژنەن، شادیەن
دەس نەگەردەنەن، ڕۆی ئازادیەن
هەی دەس بۆس دەس بۆس وەش نیگارانەن
خەیر، پا بۆس پابۆس خاتر دارانەن

جەژنی قوربانتان پیرۆز بێتو هەموو ساتەکانی ژیانتان
جەژن بێت!



## یەکەم دڵۆپ



# دەتوانین!!

سەرنووسەر

پێشکەوتنی وڵاتو نیشتمان و سیستەمەکانی ژیانو گەیشتنمان بە کاروانی ژیارو شارستانییەتشان بە شانی گەلانی دونیاو بگرە ئارەزووی پێشەنگیو سەر قافڵەییش ئاواتو خەونی هەموو کوردێکی دڵسۆزو وڵاتپەروەرو شەرەفمەندو رۆشنبیرو دانشمەندە، وەلێ تەنها خۆزگەو خەونو ئاواتی جوانو ئومێدەواری بەس نییەو پێویستە کاری بۆ بکەین.

گرفتەکەش ئەوەیە کە ئێمە زۆرجار ناگەینە ئەم ئەنجامەو پەیوەست نابین بەوەی کە هەر یەکێك لە ئێمە بە کاری خۆی هەڵسێتو رۆڵی خۆی ببینێت! دەتوانین کاری زۆربەی خەڵك کە ئارەزووی پێشکەوتنو گۆڕانو فەلاچۆکردنی هەموو جۆرەکانی گەندەڵی دەکەن، بە هەموو توێژەکانیانەوە لە دوو تەوەرەدا جێ بکەینەوە:

کۆمەڵی یەکەم: کاری دەرخستنی گەندەڵیو هەڵەو ناتەواویو رەخنەو تەنزیری فەلسەفیانەی گرتۆتە ئەستۆ، کە لێرەدا دەسەڵات بەشی شێری بەردەکەوێت، لە کاتێکدا ئێمە ئەگەر بمانەوێت رەخنەی بابەتیانە بگرین دەبێت دان بەوەدا بنێین ئەگەر کۆمەڵگا بەشێوەیەکی گشتی تاوانباری یەکەم نەبێت، ئەوا بێگومان دووەمە!!

کۆمەڵی دووەم: کلیلی گۆڕانو پێشکەوتنو هەموو جۆرە داهێنانێك لای ئەوان تەنها دەسەڵاتەو تەنها ئەو دەتوانێت بەو کارە هەڵسێتو ئێمە ناتوانین هیچ جۆرە کارێك بکەین، بۆیە باشتر وایە هەمیشە هەوڵی ئەوە بدەین بگەینە دەسەڵات، ئەگەرنا وا باشە بە رۆژ نووسینەکانی کۆمەڵی یەکەم بخوێنینەوەو بە شەویش خەوی (گولی) بە دەسەڵاتەوە ببینینو هەمیشە کارو پیشەمان بە دواداچوونی دوا هەواڵی گەندەڵییەکانو دەسەڵاتو بەرپرسان بێت!

لە کاتێکدا خاڵی بەهێزی دەسەڵات لای ئەوان تەنها ئەوەیە کە دەسەڵات پارەی پێیە!!

هەڵبەت هەمووان دەزانن کە ساڵانێکی درێژە هەردوو کۆمەڵ خەبات دەکەنو تا ئێستاش بارودۆخ گۆڕانێکی وەهای بە خۆیەوە نەبینیوە.

کەس نکوڵی لەوە ناکات کە دەسەڵات ئەرکی زۆر گەورەی لەسەر شانەو دەبێت بە کۆمەڵێك کاروچالاکی بێ شومار هەڵسێت، بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە کە دەسەڵات چۆنە؟ کێیە؟ چۆن دروستبووە؟ لە کێ پێکهاتووە؟ هاوکات دەسەڵات تاکە کەسێك نییە کە بتوانین راستەوخۆ مامەڵەی لەگەڵدا بکەین! وێڕای ئەوەی کە دواکەوتنو گەندەڵی هۆکاری خۆیان هەیە، ئایا هۆکارەکان دیاریکراون؟ چارەسەر دیاریکراوە، یاخود تا ئێستا ئێمە لەسەر زاراوەکانی گۆڕانو پەرەپێدانو ریفۆرمو چاکسازی ناکۆکین؟

ئایا کێن ئەو کەسانەی کە دەتوانن لەگەڵ وەرگرتنی دەسەڵاتدا لە شەوو رۆژێکدا وڵات بگۆڕن بە بەهەشت!؟

چی ئامادەکارییەکمان کردووەو بەرنامەمان چییە؟

یا بەرامبەر وتەکانمان خۆمان بە بەرپرسیار نازانینو ئەم پرسیارانەمان بە لاوە گرنگ نییە؟!

گرفتی ئێمە گۆڕینی ناوەکان  یا کەسەکان یا رەنگەکان نییە!!

گۆڕانو مومارەسەی شارستانی بەرنامەڕێژیو بنیاتنانەوەو ئاوەدانکردنەوە دەبێت خۆمان لە خودی خۆماندا پەیڕەوی بکەین.

فاکتەری پێشکەوتنو گەشەپێدانو گۆڕان تەنها پارەو مادده نییە، بەڵکو یەکێکە لە فاکتەرەکان، کە دەبێت ئەقڵو بیرکردنەوەو نەخشەو پلان زۆر لە پێش ئەوەوە حسابیان بۆ کرابێت!!

هاوکات دەتوانین زۆر کارو بەرنامەی گەورە ئەنجام بدەین بێ ئەوەی لە چاوەڕوانی یارمەتیدانی دەسەڵاتدا شەومان بەسەر بێت!! ئەگەر هەر یەکێك لە ئێمە لە ژیانی رۆژانەیدا بە ئەرکی خۆی هەڵسێتو هەست بە بەرپرسیارێتی نیشتمانیو ژیاریی خۆی بکات، کاتێك دەسەڵاتیشی دەکەوێتە دەست بە جوانترین شێوە کارەکانی رادەپەڕێنێت.

بەڵام کاتێك ئێمە بۆ لابردنی کاغەزێکی فڕێدراوی بەردەرگا چاوەڕوانی شارەوانی دەکەین، لەگەڵ نەمانی پۆلیسی هاتووچۆ لە شەودا ئیتر هەموو یاساکان دەخەینە پشتگوێ، سبەی بچینە سەر کورسی دەسەڵاتیش لە قسەی گەرم زیاتر هیچی ترمان پێ نابێت!!

ئێمە دەتوانین بە هاوکاری کەسانی پسپۆڕو شارەزاو پیاوانی کارو دەوڵەمەندانی وڵات دەیانو سەدان پرۆژەی بە سوودو گرنگ ئەنجام بدەینو پێش هەموو شتێکیش لە عەقڵو فکرو سەرمایەی مرۆییدا وەبەرهێنانمان ئەنجام دەدا!!

هەموو ئەو پرۆژانەش قازانجی مادیشیان تێدایە پێش قازانجی مەعنەوی، بەڵام چی دەکەیت کاتێك ئاستی رۆشنبیریو وڵاتپەروەری زۆر لە سەرمایەداران پەی بەو کارانە ناباتو ئامادە نییە لەو پێناوەدا ماندوو ببێتو خۆیان گوتەنی چییان لەو سەریەشەیە داوە.

بە داخەوە زۆربەی پرۆژە خزمەتگوزارییەکانی ئەم وڵاتە تەنها لە بواری ماددیو کەڵەکەکردنی پارەدایەو هیچ کاریگەرییەکی نییە لەسەر رەوتی پێشکەوتنی فکریو شارستانیو ژیاری، مرۆڤی کورد لە بەکاربەرێکی بچووکەوە دەکاتە بەکاربەرێکی گەورەو هیچی دی!؟

بە داخەوە تا ئێستا لە هەموو بوارەکانی خوێندنو تەندروستیو تەکنەلۆژیاو بەرژەوەندیو ئاسایشی نەتەوەییو گەشەپێدانی مرۆییو سوود وەرگرتن لە سامانی مرۆییدا ئێمە هێشتا لە ریزی نەخوێندەواراندایین، کەواتە با ئەوەی دەتوانین بیکەینو ئەنجامی بدەین. هەمووانیش دەزانن کە بڕیار یەکێکە لە گەورەترین پرۆژە نیشتمانیو نەتەوەییەکان کە ئەرکی بنیاتنانەوەی مرۆڤی کوردی لە ئەستۆ گرتووە، ئامانجی ئاراستەکردنی کۆمەڵگای کوردەوارییە بەرەو پێشکەوتنو بەرنامەسازیو رێکخستنو گەشەپێدان، تا ئێستاش وەکو دەسەڵات قڕانێکی بۆ خەرج نەکراوە، لە کاتێکدا ئەم ئەرکەی ئێمە پێی هەڵساوین ئەرکی سەرەکی دەسەڵاتەو حکومەتێك کە بانگێشەی پێشکەوتنو ئاوەدانکردنەوەو گەشەپێدانو گۆڕان دەکات تا ئێستا خاوەنی گۆڤارێکی کارگێڕی نییە کە بڕبڕەی پشتی ریفۆرمە.

ئێمە بە توانای ئاسایی خۆمان توانیمان لە مێژووی کوردا بۆ یەکەمین جار گۆڤارێکی کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی دەربکەینو لە ئاستو کوالێتی زۆر بەرزیشدا.

هاوکات خۆ هەر گلەیی لە حکومەت ناکەین، بەڵکو هیچ تاکێکی کوردیش رۆژێك لە رۆژان ئاوڕێکی لەو گۆڤارە نەداوەتەوە.

وەنەبێت بڕیار تاکە پرۆژەو دوا پرۆژەمان بێت، بەڵکو پەیمان بە گەلو وڵاتەکەمان دەدەین کە لە خزمەتکردنی کوردو کوردستاندا درێغی نەکەینو هێشتا هەگبەی گەشەپێدانو کارگێڕیو داهێنانمان پڕە.

# کارگێڕی بە گوفتار

ئەو نەتەوەیەی کە نەتوانێت سوود لە کەلەپوری خۆی وەربگرێت، هەرگیز ناتوانێت سوود لە کەلەپورو دەستکەوتەکانی کەسانی دی وەربگرێت!
«د۰عبدالکریم بکار»

کاتێك چەند کەسێك لە کۆمەڵگەدا، دوور لە بنەماکانیان بەرژەوەندییەکانیان بەدی دەهێنن، باجی ئەو کارەیان لەدەستدانی ڕەوشتو ئاکاریانە!
«د۰ عبدالکریم بکار»

تۆ ناتوانیت کاتو شێوازی مردنەکەت دیاری بکەیت، بەڵام دەتوانیت شێوازی ژیانت دیاری بکەیت!
«جۆن بییز»

عەقڵ دەفرێك نییە تا پڕی بکەین! بەڵکو ئاگرێکە پێویستە بیکەینەوە!
«بلوتارك»

ئەگەر مرۆڤ شتێکی بەدی نەکرد تا لە پێناویدا بمرێت، شایانی ئەوە نییە بژی۰
«مارتن لوپر کینگ»

باشترین سەرمایە، لای حکومەتەکان ئەوەیە کە گەلەکانیان بیر ناکەنەوە۰
«هیتلەر»

سەرکەوتن پێویستی بە کەسێکە کە خاوەنی پەیام بێت۰
«کلارنس تۆماس»

پێویستە زیاتر لەوە وەرنەگریت کە دەیبەخشیت!
«ئیلتۆن جۆن»

## کارگێڕی به چیرۆك

# هێلکەی ئاڵتونی!

لە ئەفسانەیەکی کۆندا باسی جوتیارێکی هەژار دەکات کە رۆژێك لە رۆژان لە کولانەی قازەکەیدا هێلکەیەکی ئاڵتونی بریقەداری دۆزییەوە!!

سەرەتا وای زانی گاڵتەیان پێکردووەو فێڵێکە بۆ فریودانی ئەنجامدراوە، بەڵام کاتێك ویستی کە هێلکەکە فڕێ بدات، بیروڕای گۆڕیو هێلکەکەی هەڵگرت تا بزانێت چۆن هێلکەیەکەو نرخو بەهای چۆنە!؟

بۆی دەرکەوت هێلکەکە لە ئاڵتونی تەواوە! ئای چ خۆشییەك بوو بۆ کابرای جووتیار لەخۆشیدا بڕوای نەدەکرد! بڕوای بە بەختی خۆی نەدەکردو گومانی زۆری لەلا پەیدابوو تا ئەو کاتەی بۆ سبەی رۆژ، هەمان رووداو دووبارە بووەوە، هێلکەیەکی ئاڵتونی بریقەدار لە کولانەی قازەکەدا!

رۆژانە لەخەو هەڵدەستاو بەپەلە بۆلای کولانەکەی رایدەکردو هێلکەیەکی ئاڵتونی نوێی دەست دەکەوت، بەم کارە کابرای جوتیار بەشێوەیەکی خەیاڵی دەوڵەمەند بوو، دەوڵەمەندییەکی بێ سنووری لە رادە بەدەر، لە ژیانێکی ئەفسوناوی جوانتر لە راستیدا دەژیا.

بەڵام بەداخەوە لەگەڵ زیادبوونی سەروەتو سامانو دەوڵەمەندیدا، تا زیاتر دەوڵەمەند دەبوو تەماحی زیادی دەکردو ئارامگرتنی کەمتر دەبوو ئیتر چیدی نەیدەتوانی رۆژانە چاوەڕوان بکات تاهێلکە ئاڵتونییەکەی دەست بکەوێت، ئەو چاوەڕوانییە بۆ ئەو کاتی دەویستو زیادبوونی سەروەتو سامانەکەی دوا دەخست!!

لەبەرئەوە بڕیاریدا قازەکەی سەرببڕێت بۆ ئەوەی بە یەکجار هەموو هێلکەکانی دەست بکەوێت، ئەوکاتەش سەروەتەکەی چەند قات زیاد دەکات!

بەڵام کاتێك قازەکەی سەربڕیو سکی دڕی تەماشای کرد هیچ هێلکەیەکی ئاڵتونی لە سکیدا نییە!

خۆ ئیتر ناشتوانێ چیدی هێلکەی ئاڵتونی دەست بکەوێت، چونکە ئەو قازەی سەربڕی کە ئەو هێلکانەی بەرهەم دەهێنان!!

لەم چیرۆکەوە فێردەبین کە:

١- مرۆڤ دەکرێت ژیانی لەهەژارییەوە بگۆڕێت بۆ دەوڵەمەندیو کارێکی زۆر ئاسایییەو جێگای سەرسوڕمان نییە، چونکە ماڵو سەروەت یەکێکە لە نیعمەتەکانی دونیا وەکو تێکڕای نیعمەتەکانی تر.

٢- گرنگ ئەوەیە مرۆڤ بە هۆی ماڵو سەروەتی دونیاوە فریو نەخواتو کاتێك لە سامان نزیك دەبێتەوە، رەوشتی جوانی بیرنەچێتەوە.

٣- حیکمەتو گرنگی سەروەتو سامانو دەوڵەمەندی لە زۆریو کەڵەکە کردنی پارەدا نییە، بەڵکو لە چۆنیەتی بەکارهێنانیدایە، چ سودێك لە دەوڵەمەندیدا هەیە کاتێك دەوڵەمەند پارەکانی کەڵەکە دەکاتو هەمیشە لە هەوڵی زیاد کردنیدایە، لە کاتێکدا هەژاران موحتاجی نانێکی رەق بن؟!

٤- تەماحو چاو برسێتی نەخۆشییەکی کوشندەیەو وا دەکات کە مرۆڤ هەرگیز تێرنەخواتو هەمیشە هەوڵی دەوڵەمەندی بداتو هەرچەندە بەڕواڵەت دەوڵەمەندە، بەڵام لە ناخەوە زۆر هەژارو لێقەوماوە.

٥- پارەو موڵکی دونیا هۆکارێکە بۆ خۆشبەختیو ئاسانکارییەکە بۆ ژیان، بەڵام سەرچاوەی سەرەکی شادمانیو سەرفرازی نییە، لەبەرئەوە زۆرجار مرۆڤ وا هەست دەکات کە دەتوانێت بە پارە هەموو شتێك بکڕێت بەڵام بەهەڵەدا چووە!

٦- سەروەتو سامانی دونیا وەکو ئاوێکی شۆر وایە تا زێتری لێ بخۆیتەوە زێتر تینوت دەبێت، لەبەرئەوە پێویستە بە پێی پێویست کۆبکرێتەوەو بۆ پێویستیش بەکاربهێنرێت.

٧- ئەو کەسانەی کە تەنها چێژ لە پارە کۆکردنەوە وەردەگرن، هیچ رێگایەکی تریان تاقی نەکردۆتەوە، ئەو کات ئەگەر رێگای خەرج کردنی پارەو سامانیان لە رێگای خێرو چاکەدا تاقی بکردایەتەوە، ئەوسا هەستیان بەخۆشییەك دەکرد کە هەرگیز لە ژیانیاندا هەستیان پێ نەکردووە.

٨- زۆرجار تەماحو هەڵپەکردن بۆ کۆکردنەوەی پارە، مرۆڤ بە هیلاك دەباتو وای لێدەکات کورد وتەنی: قازانج سەری مایە بخوات!

٩- هەرچەندە ئەم چیرۆکە ئەفسانەیە، بەڵام زۆر کەس رۆژانە زێتری لە هێلکەیەکی ئاڵتونی دەست دەکەوێتو بەردەوام سەروەتو سامانی زیاد دەکات، بەڵام بێگومان درهەمێك لەگەڵ خۆیدا ناباتە گۆڕو هەمووی دوای خۆی بە جێ دەهێڵێت.

١٠- هەموو دەوڵەمەندێك دەتوانێت دوای خۆی کاری باشو شوێنەواری باش بە جێ بهێڵێتو جێگای شانازیو سوپاسی خەڵك بێت، دەتوانێت بە سامانو پارەکەی خوداو پاشان خەڵکی لە خۆی رازی بکاتو دوای مردنی خۆی رەحمەتی بۆ بچێت نەك بە پێچەوانەوە.

بەشی حەوتەم

هاژە شیروانی

# سەرەتایەك لە زانستی ڕێکخستن

کارگێری لە وڵاتێکی سەرکەوتوودا:

لە وڵاتێکی پێشکەوتوو کارگێری تیایدا پشتی بەستووە بە روونو رەوانی لە رێوشوێنەکانو سیستەمو بڕیارەکان، متمانەکردنیش دەبێتە هێمای کارکردن، کۆتو بەندەکانی بەدواداچوون ون دەبن، لە ژیارییەکانی ئەم جۆرە کارگێڕییە یا ئەم ستایلە ئەم سیمایانەی خوارەوە دەردەکەون:

١- پشت بەستن بە سکرتێر یا یاریدەدەر لە راپەڕاندنی زۆرێك لە کاروبارەکانی رۆژانە، ئەم شێوازەش دەرفەتی زیاتر بە بەڕێوەبەر دەدات بۆ تەرخانکردنی بەشێکی زۆر لە کاتی بۆ پلان دانانو بیرکردنەوە، گرێدانی کۆبوونەوەکان، دەستخستنی قازانج بۆ شوێنی کارەکەی.

٢- بوونی مەرکەزییەت لە بڕیاردان، جیاوازیو بەربەستەکان هەڵدەگیرێن لە نێوان بەرپرسو بەردەستەکان، دەسەڵاتو پسپۆڕییەکان دابەش دەکرێت، هەر ئەندامێك لەم دامەزراوە هەست دەکات کە بەشداری دەکات لە سەرکردایەتی کردن و بڕیاردان، ئەمەش پاڵی پێوە دەنێت بۆ زیاتر دڵسۆزی بوون لە کارەکەیداو گیان فیدابێت بۆ خزمەتی ئامانجی دامەزراوەکەی.

٢- روونو رەوانی لە هەنگاوەکانی کارکردنو رێوشوێنەکان، گشتگیری رێکخستن لە جوڵەی کارەکانی رۆژانە وا دەردەکەوێت کە کارەکان خۆیان دەڕۆن بەڕێوە، لێرەدا پرسیارکردنو روونکردنەوە کەم دەبێتەوە سەبارەت بە وردەکارییەکانی کارکردن، چونکە هەر فەرمانبەرێك لەم دامەزراوەدا ئەرکی سەرشانی خۆی بەڕوونو ڕەوانی دەزانێت.

٣- سیستەمو یاساکان روونو سەردەمیانەنو هیچ لێکدانەوەو شیکردنەوەیەك هەڵناگرنو لێرەدا هیچ (استثناءات) ێك نییە لە سیستەمەکان یان فرۆفێڵ لێکردنیو یان پێویستی بوون بە لێکدانەوەی بۆ خزمەتی بەرژەوەندی تایبەتی.

٤- ژینگەی کار بەوە دەناسرێت کە لە جووڵەو گەرموگوڕی دایەو چاوپێکەوتنی دووبەدوو و بە کۆمەڵو هاتوچۆ کردن لە نێوان یەکەکانی یا نووسینگەکانی بۆ ڕاپەراندنی کارەکان.

٥- ونبوونی دیاردە دروستکراوەکان لەسەر کەسایەتیو هەڵوێستەکان، هەموو کارەکان بە راستی خۆیان دەردەکەون، بەرپرس سەردانی بەردەستەکەی دەکاتو لە تەنیشتییەوە دادەنیشێتو گفتوگۆی لەگەڵ دەکات لە نووسینگەکەی، دوو دڵیش نییە لە گواستنەوەی نووسراوەکان لە نێوان یەکەکانو هەندێکجار دەگاتە ئەوەی کە قاوەیەك بۆ خۆی ساز بکات یان بۆ میوانەکانی.

٦- کەمتر پشت بەستن بە بەکارهێنانی پەڕە لە کاروبارەکان، لەبەرئەوەی زۆرێك لە رێنمایو ڕێوشوێنەکان بە تەلەفۆن یان بە زارەکی رادەگەیەندرێت، ئەمەش بە متمانەکردن دەبێت، لێرەدا دەبێت زۆرتر پشت بەو کارانەی کە پێشتر ئەنجامدراونو چاپکراون ببەسترێت بۆ زۆرێك لە رێوشوێنەکان، کە بەشداردەبێت لە روونترکردنەوەی کارەکانو دوور کەوتنەوە لە تەحەکوم پێکردنی کەسی.

بەم شێوەیە دەبینین کە هەموو کارەکان لەم جۆرە ژینگانەی کارگێڕی تەندروستو ئامادەکراون بۆ بەرژەوەندی کارکردن، کار دەکات بۆ تیشك خستنە سەر کۆششی کرێکارەکان بە ئاراستەی گەیشتن بە ئامانجی دامەزراو، لێرەدا هیچ ئاڵۆزییەکی کارگێڕی نابینرێت کە کاتێکی زۆر لە کرێکارەکان ببات، و زەینیان داگیر بکات لەگەڵ نەمانی بەربەستی گەورە لە نێوان بەرپرسو بەردەستەکان وادەکات کە بەردەستەکان دوو دڵ نەبن لە سەر پێشکەشکردنی داواکاری یان واڵاکردنی دەرگای گفتوگۆ لەگەڵ بەرپرسەکان بەو بیرۆکەو پێشنیارو تێبینیانەی کە وای دەبینێت خزمەت بە بەرژەوەندی کارەکەیان بکات، هەرچی سەبارەت بە سیستەمو رێوشوێنی کارکردنە زۆر روونو رەوانە پێویست بە هیچ ڕوونکردنەوەیەك ناکات بۆ بەردەستەکان، یان جیاوازی کردن لە لێکدانەوەو جێبەجێکردنیو یان رێککردنی بۆ خزمەتی بەرژەوەندی تاکەکەسیو سوودی تایبەتی.

بابەتی دووەم

تایبەتمەندی رێکخستنی کاریگەر/

ئێمە کاتێك باسی رێکخستن دەکەین، پێویستە هەمیشە لە یادمان بێت کە پرۆسەی رێکخستن پرۆسەیەکی جێگیر نییە، بەڵکو

پرۆسەیەکی گۆڕاوەو بەدەنگ بارودۆخو ئەو گۆڕانکارییانەوە دەچێت کە لە ژینگەی ناوخۆو دەرەوەی ڕێکخراو ڕوودەدەن، هەر بۆیە کاتێك کە باس لە تایبەتمەندی ڕێکخستنی کاریگەر دەکەین پێویستە ئەوتایبەتمەندیانە لە بەرچاو بگرین بە گۆڕینی کاتو شوێنو بارودۆخی ڕێکخراوو ئەرکی ڕێکخستنیش تەنها ئەوەندە نییە کە پارێزگاری لە سەر ئەو تایبەتمەندییانە بکاتو بەس، تاوەکو ئەگەر باشیش بێت لە ماوەیەکی دیاریکراو لە مێژووی ڕێکخراودا، بەڵکو پێویستە لە سەر دانەرانی پرۆسەی ڕێکخستن کە کار بکەن بۆ وەرگرتنی پرۆگرامی ڕێکخستنو پێش گرتن لە ڕووداوەکان ئەمەش لە ڕێگای کارکردنی بۆ پێداچوونەوەی ئامانجی ڕێکخراو و لە دوایدا بنیاتنانی ڕێکخستنو ڕێوشوێنی، کە زامنی مانەوەو بەردەوامی بکات لە کارکردن بە توانستو چالاکییەکی بەرز.

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە ژمارەیەك لە (مؤشرات)ی پەیوەندیدار هەن بە تایبەتمەندی ڕێکخستنی باش کە ئەوانیش بریتین لە:

١- وەرگرتنی ناوەرۆکی تیۆریو چەمکەکانی کارگێڕی کۆنو نوێ بە تایبەتی ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بە بنەماکانی ڕێکخستنی کارگێڕیو پەیوەندی مرۆڤایەتیو گرنگیدان بە ژینگەی کارکردنی ناوخۆو دەرەوەی.

٢- دڵنیابوون لە سەر گرنگی پێوانەکردنی ئەو لە ژێر ڕۆشنایی ئامانجە دیاریکراوەکان بۆ هەر ڕێکخراوێك یا کارگێرییەك، ئەمەش بەوەی کە ڕێکخستن تەنها ئامانجێك نییەو بەس، بەڵکو شێوازێکە کە لە ڕێگایەوە دەتوانین بگەین بە ئامانجەکانی کارکردنو پەرەپێدانو باشترکردنی ئەدا، هەر بۆیە دڵنیابوون لەسەر گرنگی بوونی شێوازێك بۆ پێوانەکردنی ئەداو دیاریکردنی ئاراستەی لە لایەنی پۆزەتیڤو نێگەتیڤی بە یەکێك لە (مؤشرات)ەکانی تایبەتمەندی ڕێکخستنی باش دادەنرێت.

٣- پەرەپێدانو کاراکردنی پرۆگرامی چاودێری لە خۆوە (تلقائی): لێرەدا ڕێکخستنی باش هەڵدەستێت بە ئاسانکاری پرۆسەی چاودێری لە ڕێگای دیاریکردنی ئامانجی یەکە کارگێرییەکانو بەستنەوەی هەموو یەکەیەکی کارگێڕی بە یەکتریو ڕاگەیاندنی ئەرکەکانیان، بە جۆرێك کە دەستنیشان کردنی بەرپرسیارییەتی هەموو کارگێڕییەکان بکرێتو وا بکات کە بەرپرس بێت لە بەرامبەر کارگێڕیو یەکەکانی تر، ئەمەش دەبێتە هۆی پەرەپێدانی چاودێرییەکی لە خۆوە لە لایەن ئەم یەکانەو کرێکارەکانی جا چ پەیوەندیدار بێت بە ڕاپەراندنی ئەو ئەرکانەی کە پێیان سپێردراوە یا پەیوەندیدار بێت بە ڕاپەراندنی سەبارەت بە ئەداو بەرهەمی یەکەی کارگێڕی تری پەیوەندیدار پێوەی.

٤- هەماهەنگی لە نێوان کارگێڕی دادەنرا، لێرەدا دووپاتی دەکەینەوە بەوەی بە یەکێك لە (مؤشرات)ەکانی تایبەتمەندی ڕێکخستنی کارگێڕی باش دادەنرێت، ئەمەش بەوەی کە ڕێکخستنی باش ئەوەیە کە یارمەتیدەرە لە سەر هەماهەنگی لە نێوان هەموو یەکە کارگێرییەکان کە زامنی هاوکاریو ئاسانکاری هەموو کۆششێك دەکات بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجی دیاریکراوی.

٥- کەمکردنەوەی تێچوون، بە دڵنیاییەوە کە ئامانجی سەرەکی هەر ڕێکخستنێك بریتییە لە: گەیشتن بە ئامانجەکانی، ئەمەو جگە لەوەی کە ئەو ئامانجانە پێویستە لە ژێر حوکمی پێوەرەکانی تێچووندا بن، هەر وەکو مەحکومن بە داواکاری جۆری یا کوالێتی ئەدا، هەر بۆیەشە کە ڕێکخستنی باش ئەوەیە کە بە ئاگا بێت لە سەر گەیشتن بە ئامانجەکانی بە کەمترین تێچوون لەگەڵ پاراستنی ئاستی جۆری بەرز لە بەرهەم یا خزمەتی پێشکەشکراو.

٦- وەرگرتنی گۆڕان وەکو پرۆگرامی پەرەپێدانو مانەوەی ڕێکخراو: دەبینین کارکردنی ڕێکخراو بە بەردەوامی لە ژینگەیەکی ناجێگیر بە مانای لە سەری پێویستە کە وەڵامدانەوەی هەبێت لە گەڵ دانەکانی ژینگەی ناوخۆییو دەرەکی ئەمەش لە ڕێگای وەرگرتنی پرۆگرامی گۆڕان، بە تایبەتیش گۆڕانی پلان بۆ داڕێژراو وەکو پرۆگرامێکی پەرەپێدانو مانەوەی ڕێکخراو، هەر بۆیە ڕێکخستنی کارگێڕی باش ئەو ڕێکخستنەیە کە کاردەکات بە بەردەوامی لە سەر پێشبینی ڕووداوەکانو دارشتنی پلان بۆ ڕێکخراو لە پێناو گواستنەوەی لە باری ئێستایدا بۆ داهاتوو بە سوودمەند بوون لە تاقیکردنەوەکانی پێشووی ڕێکخراو و شارەزایی ڕاوێژکاری گۆڕانو ڕێکخستنی کارگێڕی لە لایەکی تری.

کەواتە دەتوانین بڵێین کە ڕێکخستنی باش ئەو ڕێکخستنەیە کە یارمەتی ڕێکخراو دەدات لە سەر گەیشتن بە ئامانجەکانی بە کەمترین تێچوونو بە هەند وەرگرتنی بوونی ژینگەی کارکردن کە زامنی دابین کردنی پەیوەندی مرۆڤایەتی باشو ئاڵوگۆڕکەر لە نێوان کرێکاران یارمەتیدەر بێت لە سەر پاڵپشتی کردنو پاداشت کردنیان بەو پەڕی کۆششو تواناو وزەیان لە پێناو یارمەتی ڕێکخراو لە سەر گەیشتن بە ئامانجەکانی.

## خەندەی کەرگێڕی



## 3

## تووتی

دەوڵەمەندێك ڕۆیشت بۆ دوکانی فرۆشتنی باڵندە ماڵییەکان، لە دوکانەکەدا (٣) تووتی زۆر جوانی بینی، لە شێوەو ڕەنگدا زۆر لە یەك دەچوون، لە دوکاندارەکەی پرسی: ئەو تووتییەی لە لای چەپەوە هەڵنیشتووە، نرخەکەی چەندە؟ دوکاندار: تەنها (٥٠٠) دۆلار، دەوڵەمەندەکەش زۆر بەسەر سورمانەوە وتی: بۆچی؟! دوکاندار: لەبەرئەوەی بە باشی دەزانێت کۆمپیوتەر بەکاربهێنێت! پاشان پرسیاری لە نرخی تووتی دووەم کرد، دوکاندار: ئەویان نرخەکەی (١٠٠٠) دۆلارە، چونکە زۆر بە باشی دەزانێت کۆمپیوتەر بەکاربهێنێتو شارەزایی تەواوی لە زمانی ئینگلیزیدا هەیەو هەڵگری بڕوانامەی (ICDL) چەندین خولی وتۆتەوە سەبارەت بە کارپێکردنی یاسای (لیناکس).

دەوڵەمەندەکە زۆر بەسەر سورمانەوە، پرسیاری لە نرخی تووتی سێیەم کرد؟ دوکاندارەکەش لە وەڵامدا وتی: ئەوەیان نرخەکەی (٢٠٠٠) دۆلارە، دەوڵەمەندەکە وتی: ئەوەیان ئیشی چییە؟

دوکاندار وەڵامی دایەوەو وتی: هیچ شارەزایی و کارێکی ئەوتۆی نییە، تەنها ئەوە نەبێت کە ئەو دوو تووتییەی تر بانگی دەکەن: جەنابی بەڕێوەبەر!

سکرتاریەت

# پەرەپێدانی کارامەییەکانی پیشەی سکرتێری

زنجیرەی پازدەیەمو کۆتایی

ئا/ عومەر عەبدولقادر

بۆ پەرەپێدانی بەردەوامی پیشەکەتو سەرکەوتن تیایداو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی بەڕێوەبەرو میوانانت پەیڕەوی ئەم ڕێنماییانە بکە:

١- پیشەکەت بە باشی بناسەو لێی تێبگە:

* لە شێوازی هەڵسوکەوتی بەڕێوەبەرو چۆنیەتی مامەڵەکردنی لە کاردا، شارەزا بە.

* پێش ئەوەی بە هیچ کارێك هەڵسیت، ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی پیشەکەت بزانەو بە وردی بەدواداچوونو لێکۆڵینەوە بکە لە بارەیانەوە، ئەمەش لە ڕێگەی:

- ئەزموون وەرگرتنو پرسیارکردن لە سکرتێری پێشوو (ئەگەر هەبوو).

- گەڕان بەناو کەلوپەلەکانی نوسینگەکەتو ئاشنابوونت بەو نموونەو شێوازو ڕێگەو دۆسییانەی کە پێشتر بەکارهاتوون.

- خوێندنەوەی ئەو ڕێنماییو ڕێوشوێنانەی کە تایبەتن بە نوسینگەکەتو پێویستە لە کاتی بەجێهێنانی کاروبارەکاندا پەیڕەویان بکەیت.

- خوێندنەوەی پلانی ستراتیژی دامەزراوەکە بەمەبەستی زانینی ئەرکو ڕۆڵی خۆت لەو پلانەدا.

- زانینی ناوو ڕاژەی بەڕێوەبەرانی تری دامەزراوەکەت، ئەوانەی کە تۆ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەیت.

٢- پلانێکی وردو سەراپاگیر بۆ کارەکەتو کاتەکانت دابنێ:

* لە دانانی پلان بۆ بەڕێوەبردنی کاتەکانت ڕەچاوی کاروبارە لە پێشترو سەرەکییەکان بکە، ئەمەش لە میانی لە بەرچاوگرتنی فەرمانو داواکارییەکانی بەڕێوەبەرو هەڵسەنگاندنی کاروبارەکان لە لایەن خۆتەوە، دەبێت.

* کاتو بارودۆخی گونجاو بڕەخسێنە بۆ بەڕێوەبەر، تا کارەکانی بەڕێكوپێکیو بە باشیو لە کاتی خۆیدا ئەنجام بدات.

* ڕۆژانە لە کاتی خۆیدا بگەرە شوێنی کارەکەتو بە پلانو بەرنامەی کاری ئەو ڕۆژەدا بچۆرەوەو پاش دەستنیشانکردنی کاری یەکەمت دەستبکە بە بەجێهێنانی.

* پێش ئەنجامدانی هەر کارو ئەرکێك پلانی بۆ دابنێو کاتی پێویستی بۆ تەرخان بکەو تا بە یەکجاریو بە تەواوی ئەنجامی نەدەیت دەستی لێهەڵمەگرە بۆ ئەوەی دووبارە نەچیتەوە سەری.

* سەرەتای کاری ڕۆژانەت بە ئەنجامدانی ئەو کارانە دەستپێبکە کە پێویستیان بە وردەکاریو هەوڵدانی زۆر هەیە.

* هەوڵ مەدە لە یەك کاتدا چەند کارێك پێکەوە ئەنجام بدەیت، بەڵکو تەنها سەرقاڵی ئەو کارەبە کە پێویستە لە پێش کارەکانی ترەوە ئەنجامی بدەیت.

* باشترینو ئاسانترین ڕێگە بدۆزەرەوە بۆ ئەنجامدانی کارەکانو هەوڵبدە هاوکاری لە کەسانی تر وەربگرە بۆ ئەنجامدانی هەندێ لە کاروبارەکانت.

* مێشكو دەروونت ماندوومەکە بەو کارانەی کە سروشتێکی نارەحەتیان هەیەو پێویستیان بە وردەکارییەکی زۆرە، کاتەکانت لە نێوان کاری قورسو ئاساندا ڕێکبخە.

* دوای ئەنجامدانی هەر کارێکی قورسو نارەحەت ماوەیەك بۆ پشوودان تەرخان بکە، بە مەبەستی خۆ بەدوورگرتن لەهەر بێهێزبوونێکی جەستەییو شڵەژانێکی دەروونی کە لە ئەنجامی زۆر خۆماندووکردنەوە ڕوودات.

* لە میانی کاری ڕۆژانەدا کاتێك تەرخان بکە بۆ پێداچوونەوەی کاروبارەکانت بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی دەرەنجامەکانی کارکردنو تۆمارکردنی تێبینییەکانو دەستنیشانکردنی کەمتەرخەمیو کەموکوڕییەکانی کار.

٣- بە لێهاتووییەوە لەگەڵ کارتێکەرە دەرەکییەکان مامەڵە بکە:

* بەردەوام ئامادەبە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کارتێکەرە دەرەکییەکان، وەك وەڵامدانەوەی پەیوەندی تەلەفۆنیو هەرپرسیارو قسەیەك کە ئاراستەت دەکرێت.

* ئەو ماوەیەی لە کار دادەبڕێیت بە هۆی کارتێکەرە دەرەکییەکانەوە، ئاسایی بە بەشێك لە کارەکەتی دابنێو هەوڵبدە بە خێرایی بگەڕێیتەوە سەر کارەکەت.

* لە کاتی پلاندانان بۆ دابەشکردنی کات، ماوەو کاتی تەواو بۆ کارتێکەرە دەرەکییەکان تەرخان بکە.

٤- نوسینگەکەت ڕێکبخەو کەلوپەلی پێویستی تێدا دابنێ:

* بەشێوەیەکی وردو ڕێكوپێك نوسینگەکەت ڕێکبخەو کەلوپەلەکان لە شوێنێك دابنێ کە بە ئاسانی دەستت پێیان بگاتو نەبنە ڕێگر لەبەردەم ئەنجامدانی کارەکانت.

* نوسینگەکەت قەرەباڵغ مەکە بەو کەلوپەلانەی کە بەردەوام بەکاریان ناهێنیت.

* نوسینگەکەت مەکە بە کۆگایەك بۆ کەلوپەلو کاغەزی زیادەو بەسەرچوو.

* بەردەوام پاکوخاوێنیو دیمەنی جوانو ڕێكوپێکی ڕووخساری نوسینگەکەت بپارێزە، تا ڕەزامەندی بەڕێوەبەرو میوانەکانت بەدەست بهێنیت.

بە تەواوبوونی ئەم بابەتە کۆتایی بەم زنجیرە باسە دێنین، هەرچەندە بابەتی سکرتاریەتو بوارو لایەنەکانی هەڵدەگرێت لەمە زیاتر تاووتوێ بکرێتو زۆرتری لەسەر بنووسرێت.

هەروەها بەدڵنیاییەوە دەکرێت سکرتێر لە میانی ئەزموونو کاری ڕۆژانەیدا زیاتر شارەزای پیشەکەیو هەڵسوکەوتکردنو مامەڵەکردن لەگەڵ بەڕێوەبەرو میوانانو چۆنیەتی بەڕێوەچوونی کارەکانو بەڕێوەبردنی نوسینگەکەی بێت.

لە کۆتاییدا دەخوازین ئەو کەسانەی بە تایبەت خاوەن (پیشە سکرتێرییەکان) ئەم زنجیرە باسەیان بینیوەو خوێندویانەتەوە، سوودیان لێوەرگرتبێو بووبێتە ڕێپیشاندەرو ڕێنوێنیو کارئاسانی کردبێت بۆیان لە ئەنجامدانی کارەکانیان بە ڕادەیەکی خوازراوو پەسەند.

بۆ نوسینی ئەم زنجیرە باسە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

- أسرار التألق فی السکرتاریە العصریە. اعداد: عبدالخالق حجیرە، دار ابن حزم، الطبعە الاولی،٢٠٠٦ .

- تعلم فنون السکرتاریە الاداریە.موقع:کنانە اونلاین (الصندوق المصری لتکنولوجیا المعلومات والاتصالات).

- چەند ژمارەیەك لە بڵاوکراوەی (سری و عاجل) ی تایبەت بە سکرتارییەت.



# ڕاوێژکار کێیەو؟ ڕاوێژکاری چییە؟

و: هەستیار هەورامی

لەم سالأنەی دواییدا وشەو چەمکەکانی «راوێژکارو، راوێژکردنو، سەنتەری راوێژکاری» زۆر دەکەوێتە بەر گوێمانو چەندین سەنتەر بە تابلۆی سەوز رەنگەوە لە شاردا سەرنجمان بۆ لای خۆیان رادەکێشن، بەڵام ئایا ئێمە هەر لە بنەڕەتدا ئەوە دەزانین کە راوێژکردن چییەو راوێژکار کێیەو سەنتەری راوێژکاری چ جۆرە شوێنێکە؟

ئەمە پرسیارێکە لەوانەیە هەندێکمان وەڵامەکەی بزانینو هەندێکیشمان بە گومانو دوودڵییەوە وەڵامی بدەینەوە، لێرەدا بە کورتی ئەم وشەو چەمکانەتان پێ دەناسێنین:

یەکەم/ راوێژکار:

ئەو کەسەیە کە ئاستی خوێندنی لە قۆناغەکانی ماجستێرو دکتۆرادایە لە بواری دەروونناسی راوێژکاریدا، کە سەرقاڵو خەریك دەبێت بە رێنومایی کردنی تاکەکانی کۆمەڵگەوە.

دووەم/ راوێژکاری:

یەکێکە لە بەشەکانی دەروونناسیو راوێژکاریو رێنومایی کردن یاخود دەروونناسی راوێژکارییە، کە یارمەتی ناسینی تواناو لێهاتووییە جەستەییو زەینیو سۆزیاریو عاتیفییەکانی مرۆڤ دەداتو هەلو زەمینەی گەشەکردنی گونجاوو پێگەیشتنی فەراهەم دەکات.

مرۆڤ بە درێژایی ژیانی پێویستی بە چەندین تواناو لێهاتوویی جۆراوجۆر هەیە، کە یەکێك لەو تواناو لێهاتووییانە بریتییە لە چارەسەرکردنی مەسەلەو کێشەو بابەتەکانو هەڵسوکەوتو مامەڵەو رەفتاری راستو دروست.

کاتێك مرۆڤ هەستو شعوری پێویستیو ئاتاج بوونی بە دەستخستنی یارمەتیو هاوکاری یاخود رێگە چارەیەکی نوێ هەبێتو خۆی بە تەنهایی نەتوانێت دەستەبەری بکات، ئەوا سەردانی راوێژکارێك دەکات، کە ئەم سەردانە بە گفتوگۆیەك دەست پێدەکات.

گفتوگۆ: واتە قسەکردنی رووبەڕوو لە نێوان دوو کەس یان زیاتردا، (موراجیعو راوێژکار) کە گفتوگۆیەکی ئامانجدارەو هەوڵی دەستنیشانکردنی کێشەو گرفتی موراجیعەکە دەدرێتو هەوڵی لادانی ئەو گرفتە دەدات، کە ئەمانە خاڵە سەرەکیو دیارەکانی گفتوگۆیە، کە جیای دەکاتەوە لە گفتوگۆیەکی ئاسایی.

ئەم کۆبوونەوانە کە لە سەنتەری راوێژکاریدا ئەنجام دەدرێن، بە پێی پێویستیو ئاتاجی کەسی موراجیع دەتوانرێتو دەکرێت هەفتانە یان مانگانە یاخود ساڵانە درێژەیان پێ بدرێتو، کەسی راوێژکار یارمەتی کەسی موراجیع دەدات تاوەکو بگات بە بەصیرەتو بەرچاوڕوونیو دیدو تێڕوانینی پێویست بۆ چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانی.

بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەرکی راوێژکار ئەوە نییە کە هەمیشەو بەردەوام لەگەڵ موراجیعەکەیدا بێت، بەڵکو فێربوونی تواناو لێهاتووییەکانی وەك: ناسینی خودو کەسانی دیکەو دەستنیشانکردنی تواناو لێهاتووییەکانی خۆیو شێوازی مامەڵەکردنو رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کەسانی دەوروبەرو توانای چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانە.

کۆبوونەوە تایبەتەکانی چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکان لە نێوان موراجیعو راوێژکاردا بە زۆری لە نێوان (٤٥) تا (٦٠) خولەکدا ئەنجام دەدرێنو بە پێی پێویستی کەسی موراجیع دانیشتنو کۆبوونەوەکانی داهاتوو دەستنیشان دەکرێن.

هەرکەسێك ئازادە کە بە پێی حەزو سەلیقەی خۆی راوێژکار یان سەنتەرێکی راوێژکاری هەڵبژێرێت یاخود بیگۆڕێت.

دواجار، سەنتەری راوێژکاریش بە شوێنێك دەوترێت کە ژمارەیەك دەروونناسو توێژەری کۆمەڵایەتیو راوێژکاری پەروەردەییو پزیشکی دەروونناسی تێدایەو بە شێوەی تیمو گروپ پێکەوە کار دەکەن.

سەرچاوە/ گۆڤاری موفقیت. ژمارە (١٧٥).

بەشی دووەم

و/ ئەسکەندەر ڕەحیم

# خاڵە بەهێزەکانت بخەرە گەڕ

**هەنگاوی دووەم:**
**خاڵە بەهێزەکانت دیاری بکە:**

تۆ بە چاکی خاڵە بەهێزەکانت دەناسیتەوە؟

لەمەوبەر کە داوات لەکەسانی دیکە دەکرد، باسی خاڵە لاوازەکانیان بکەن، ئایا سەرنجت داوە؟ ئەوان وەها لولی دەدەنو بای دەدەنەوە بەجۆرێك هەر لە یەکەم ساتدا وا خۆیان پیشانت دەدەن، ئەوانە چاکین نەك خراپی، لەبەرئەوەی یەکێکیان دەڵێت: دڵپاکی لە ڕادەبەدەر خاڵی لاوازی منە، لە کاتێکدا یەکێکی دیکەیان دەڵێت: حەز بە ڕێكوپێکی هەر کارێك دەکەم کە پێی هەڵدەستم، ئیدی بۆ خۆیی چێشتیش بێت، کەسێك نابینیت دان بنێت بەوەی کە پێویستی بە هیواو چاو لە ئامانج برین یان تەگبیرو دانایی هەیە٠

بەڵام ئەو شتانەی ئەوان بە خاڵە بەهێزەکانو چاکیو تایبەتمەندی پیشانیان دەدەن،لە ڕاستیدا وانیە، چونکە خاڵە بەهێزەکانت ئەو شتانەیە کە هەمیشە بە باشی پێی هەڵدەستیت، ئەوەش لە ڕێكوپێکیو تەواوەتییەوە نزیکترە، بۆ نموونە ئەگەر تۆ پەرستارێك بیت ئەوا لات ڕوون بێت یەکێك لە خاڵە بەهێزەکانت خۆی دەبینێتەوە لە توانای دەرزی لێدانی نەخۆشەکان، بێ ئەوەی هەست بەئازار بکەن٠

سێ هۆکاریش هاوکاری دەرخستنی خاڵە بەهێزەکانت دەکەن:

١- بەهرە: بۆ نموونە لە متمانە بەخۆبوونت، توانای پەیوەندیو چێژوەرگرتنت لە گیانی کێبڕکێدا خۆی دەنوێنێ٠ ئەم بەهرەو بەخششانە خۆڕسکی دەبن، واتە تۆ پێیانەوە لەدایك دەبیتو کاریگەرییەکەی بەدرێژایی ژیانت، لە کەسێتیتدا ڕەنگ دەداتەوە٠

ئەو کارەیە کە سەختی گۆڕینی کەسێتیت، پینەکردنی کەمو کوڕییەکانت یان چاککردنەوەی خاڵە لاوازەکانت، ڕوون دەکاتەوە٠

٢- کارامەیی: لە لێوەشاوەییو دەستو بردی یان دەست سوکیت وەك پەرستارێك لە دەرزی لێدانی نەخۆش، بێ ئەوەی ئێشو ئازاری پێ بگەیەنیت، خۆی دەنوێنێ، یان لەشارەزاییو داناییت وەك بەرپرسی فرۆشەمەنییەکان، لە شیکردنەوەی بەرهەمەکەتو بەراوردکردنی بە بەرهەمەکانی ڕکابەرەکانت خۆی دەخاتە

روو، ئـەم کارامەییە بە ئاوی فێربوون ئاو دراوە، کارێکە مرۆڤ بە دەستی دەهێنێت و لە سکی دایکییەوە نایهێنێت.

٣-زانیـاری: وەك زانینی بڕی گونجاوی ئـەو دەرمانەی دەبێ نەخۆش بیخوات، یان زانین و ناسـینی ڕکابـەرە بەهێزەکانت لە بـازاڕدا، زانیاریـش دیسـانەوە دەتوانرێت بەدەست بهێنرێت.

## کێ باشـترین کەسە بڕیار لەسەر خاڵە بەهێزەکانت بدات؟

گەر خاڵـە بەهێزەکانت ئەو چالاکیانە بـوو کـە تیایـدا لە پێشـتریو هەسـتی دەرکەوتوویـیو هەڵکەوتوویـیت پـێ دەبەخشـێت، ئەوا چاکترین کەس بتوانێت بڕیاری لەسەر بدات یان تەنیا کەسێك گەر بتەوێـت بە وردی توانای ئـەوەی هەبێت، ئەو کەسە تەنها خۆتیت!

بێ لە خۆت هیچ کەسـێك نییە توانای دەست نیشانکردنی ئەو چالاکیانەی هەبێت کە خۆشـیت لێیان دێتو ئەوانەشی لێیان وەڕەزیـت یان ئـەو چالاکیانەی هەسـتی بەهێزیـت پـێ دەبەخشـنو ئەوانەش کە هەسـتی لاوازی دەکەنـە بەشـت. بۆیـە تێڕوانیـنو پێودانگەکانـت خۆبەخـۆ ئەو تاقە ڕێگەیە هەمیشە بە دروست دادەنرێ.

هیچ بوارێك بۆ گومان مەهێڵەرەوە:

متمانـەت بـە تێڕوانینەکانـت لـە دۆزینـەوەی خاڵـە بەهێزەکانـت هەبێتو سوریشـبە لەسـەر ئـەوەی سـەرنجت رادەکێشـێتو خۆشـیت پـێ دەبەخشـیو ئەوەیشـی خـۆت تیایـدا بەسـەرکەوتووو دەرکەوتـوو دەبینیتـەوە هەوڵـی چـاك بەکارهێنانـیو هێنانـە بەرهەمـی بـدە. دڵنیاشـبە لەوەی بە ئەنجام گەیاندنەکەت سەرت سوڕ دەمێنێ.

بیدۆزەرەوە، بیقۆزەرەوە، بیهێنەبەر:

با ئامانجەکەت لـەم قۆناغەی ژیانتدا، دۆزینەوەی خاڵە بەهێزەکانت بێت، پاشـان هەوڵـی روونکردنـەوە، قۆسـتنەوە یـان بەکارهێنـانو هێنانە بەریان بە باشـترین شێوازی شیاو بدە.

بۆئـەوەی توانـای دیاریکردنـی ئـەو خاڵانـەت بە ڕێگەیەکی راسـتو دروسـت هەبێـت، قەڵـەمو کاغەزێـك بهێنە، سـێ دەسـتەواژە بنووسـە کە بە ئاشـکرا باسی ئەو کارەی چاك دەیزانی بکات، بەمەرجێك ئەم دەسـتەواژانە بە یەکێك لە تاقیکارییە کەسـێتییەکان یـان بـە گوزارشـەکانی هەڵسـەنگاندنی ئەنجام گەیانـدن پشـت ئەستور نەبێتو لەپلەی یەکەمدا پشت بەو چالاکیانە ببەستێت کە لەوادەی هەفتەیەکدا پێـی هەڵدەسـتیت. لـەم چالاکیانە چاك بیربکـەرەوەو هەوڵـی پۆلێنکردنیـان بە گوێـرەی ئەندازەی لێهاتووییت بدە، ئەوجا لەوەی خۆت تیایـدا بەدەرکەوتوو دەزانیت رابمێنە، باشـترین سـێ چالاکیـان پوخت بکەرەوەو ناسـاندنێکی تێرو تەسـەلیان لە سێ دەسـتەواژەکەی پێشـوودا بۆ بنووسە، لێرەدا ئەو ململانێیە سـەر هەڵدەدا، چەند مانگێك ڕەنگە چەند ساڵێکیش ڕووبەڕووت ببێتەوە. ئەویش دەتوانیت لەم پرسـیارەدا پوختـی بکەیتـەوە: چـۆن دەتوانـم لەم هەفتەیەدا خاڵـە بەهێزەکانم، لە هەفتەی رابردوو چاکتر تۆکمەیان بکەم؟

لەبـەر گرنگی ئـەو دەسـتەواژانە لە دیاریکردنـی ئایندەت، ئەوا بەشـێوەیەکی دەست نیشـانکراو، وردو ئاسان دایانبڕێژە. پاشـان هەر جارێـك دەیانخوێنیتەوە یان تەماشـایان دەکەیت، هەسـتدەکەیت بەرەو پێشەوە هانت دەدەنو دەتجوڵێنن.

پێش دەسـتکردن بـە روونکردنەوەی هـەر شـتێك پێـی هەڵدەسـتیت بـۆ هاوەڵانت، یان بەر لەیارمەتی خواسـتن لە سـەرۆکەکەت، سەرەتا پێویستە لە دروستی ئەو دەستەواژانەی نووسـیوتن دڵنیا بیت، ئەوەش بە ئەنجامدانی ئـەم تاقیکردنەوە تۆکمەیەی لای خوارەوە دەبێت:

تاقیکردنـەوەی تۆکمەیـی یـان خاڵە بەهێـزەکان، بـۆ ئەوەی لـە وردیو جوان هەڵبژاردنـی ئەو سـێ چالاکییـەی تیایدا خۆت هەم بەسەرکەوتوو هەم بەدەرکەوتوو دەزانیت، ئـەم تاقیکردنەوەیـەی خوارەوە ئەنجام بدە: ئینجـا (١نمرە) دابنێ لە بری هەر وەڵامێکی بـە (لەگەڵیدا زۆر ناکۆکم)، (٢نمرە) بۆ هەر وەڵامێکی (لەگەڵیدا ناکۆکم) دابنـێ، (٣نمرە) بۆ وەڵامـی (دڵنیا نیم)، (٤ نمـرە) بۆ وەڵامی (لەگەڵیـدا کۆکم) دابنێ، تاقیکردنەوەکانیش:

١- سـەرکەوتنێکی بـێ وێنـەم لـەم چالاکییەدا تۆمارکردووە.

٢- هەردەم کەسـانی دیکـە ئەوەم پێ دەڵێـن کـە لـەم جـۆرە کارو چالاکییەدا بەهرەمەندم.

٣- شـاباشو پاداشـت یـان بڕوانامەی ڕێزلێنانـم، لەبـەر دەرکەوتوویـی لـەم چالاکییەدا بەدەست هێناوە.

٤- رۆژانە بەم چالاکییە هەڵدەستم.

٥- ئارەزوویەکـی بـێ ئەنـداز لـە خۆبەخشی بۆ ئەم چالاکییە، بەدی دەکەم.

٦- هەسـت دەکـەم ئـەم چالاکییـە خۆڕسکییەو ناتوانم دەست بەرداری ببم.

٧- ئەم چالاکییە بە باشـترین شێوازو لە کاتێکی پێوانەییو زوودا رادەپەڕێنم.

٨- رۆژانـە ئـەم چالاکییـە بەشـێکی گەورەی بیرکردنەوەم داگیر دەکات.

٩- تامـەزرۆو تینـووم بـۆ فێربوونی هەرشتێکی تازە لەم بوارەدا.

١٠- هەمـوو کاتێ بـە وردی بۆ ئەنجام گەیاندنـی ئـەم کارە، دەڕوانـمو چـاوم لەسەریەتی.

١١- کە بیـر لەو کاتەی لە راییکردنیدا بەسـەرم بردووە دەکەمەوە، خۆشیو شادی دامدەگرێ.

١٢- نـاوە نـاوە (جارناجـار) لـە کاتی ئەنجامگەیاندنیدا، هەسـتێکی قوڵی بەخۆ رازیبوون دامدەپۆشێ.

ئەگەر سـەرجەمی نمرەکانت (٥٣) یان زۆرتربـوو، ئـەوا بێگومان ئـەم چالاکییە خـۆی یەکێکە لە خاڵـە بەهێزەکانتو ئەو تایبەتمەندیانـەی بێنەوبەرەو پێشـبڕکێ لەسەرەو لەسەرتە بیکەیتە تەوەرەی بایەخ پێدانو قاڵبوونەوەت لە هەفتەو مانگەکانی داهاتوودا.

لە کۆڕو کۆبوونەوەکانی ئەو کەسانەی سـوورن لەسـەر تاوتوێکردنی ئەوەی لە خاڵـە بەهێزو لاوازەکانیانـەوە فێربوون، بەشـداری بکە، ببە بـە ئەندامێکی کاراو کاتێکیـش بـۆ راگەیاندنی ئـەوەی پێی گەیشتووی لەبارەی لە بارترین سێ خاڵی بەهێز کـە ئەنجـام گەیاندنەکەت بەرەو باشـی دەبەن، تەرخان بکـە، هەروەها لە بارەی نا لەبارترین سێ خاڵی لاوازیش کەوا لە ئەنجام گەیاندنەکەت دەکەن لە ئاستی خـوازراودا نەبێت، تا لـە ئەزموونەکەت کەڵـك وەربگرن، لـەو ئەزموونە سـوود وەربگـرە تـا ئەرکێـك بدەیتـە دەسـت کەسێکیان یان بۆ ئەوەی هەوڵی پێکهێنانی دەستەیەکی سـەرکەوتوو، بۆ راپەڕاندنی گەڵاڵەو پرۆژەیەکی دیاریکراو بدەیت.

ڕەنگـە ئەم کارە لـە رووی تێڕامانەوە ئاڵۆزبێت، بەڵام لەکاتی جێبەجێکردندا بە زوویی ئەنجام گەیاندنێکی جوانت دەسـت دەکەوێتو سەرسامت دەکات!

پاش دانانی بەردی بناغەی دەستەکەت، لەگەڵ هەریـەك لە ئەندامـەکان، بە جیا کۆبوونەوەیـەك ببەسـتە. بۆ ئـەوەی بە ئاسانی لەسـەر ئەو خاڵە بەهێزولاوازانەی هەیانە رابوەستیت، جا کاتێك تاوتوێکردنی چۆنیەتی گەڵاڵەو پرۆژەی تازە هاتە پێش، دوای زانینـی چۆنیەتـی ملکەچکردنـی خاڵـە بەهێزەکانیان بـۆ خزمەتی هەموو دەستەکە، ئەندامەکانی دەستەکەت لە پڕدا لێشاوێك پێشـنیازی جوان کە شیاوی قسە لەسەرکردنە دەخەنە روو.

خلاصات ٣٤٨

# توانای سەرکردایەتی کردنت هەیە؟



و: هەڵمەت فؤاد

دەشێت تۆ توانای ئەوەت هەبێت سەرکردە بیت، بەڵام بە خۆت نەزانیبێت، ئەم پرسیارانەی خوارەوە وەڵام بدەرەوە تا سەرەنجام بزانیت ئایا حەزو ویستی سەرکردایەتی کردنت هەیە یان کەسایەتییەکی پاشکۆیتو بەسەر رێگەی ئەوانی تردا گوزەر دەکەیت؟! بۆ هەڵبژاردنی وەڵامی یەکەم ژمارە (١)و بۆ وەڵامی دووەم ژمارە (٢)و بۆ وەڵامی سێیەم ژمارە (٣) هەڵبژێرەو پاشان تێکرای ئەو ژمارانەی کە بە دەستیان دێنیت کۆیان بکەرەوە:

١- بەرزترین پلە چی بووە کە تاکو ئێستا وەرتگرتبێت لە کارەکەتدا؟

أ- بەڕێوەبەر. ب- سەرپەرشتیار. ج- هەرگیز پلەیەکی کارگێری بەرز یان سەرپەرشتیاری کردنم وەرنەگرتووە.

٢- ئایا هیچ کات لە لیژنەیەکدا ئەندام بوویت؟

أ- بەڵێ سەرۆکی لیژنەکەش بووم. ب- بەڵێ ئەندامێکی کارا بووم. ج- نەخێر.

٣- پێت وایە ببیتە سیاسییەکی لێهاتوو؟

ا- بەڵێ. ب- لەوانەیە. ج-نەخێر.

٤- ئەو خەونە چییە کە دەتەوێ بیکەیتە راستەقینەیەك لە واقعی ژیانتدا؟

ا- بگەمە بەرزترین پلە لە کارەکەمدا. ب- لە رووی داراییەوە بگەمە ئاستێکی باڵا. ج- ببمە خاوەنی خێزانێکی بەختەوەر.

٥- ئایا لە جلوبەرگدا لەگەڵ مۆدێلدا هەڵدەکەیت؟ یان شێوازی تایبەتی خۆت هەیە؟

أ- شێوازی تایبەتی خۆم هەیە. ب- هەردووکیان. ج- هەمیشە نوێترین مۆدێل دەپۆشم.

٦- هەڵوێستت چۆنە لەبارەی فەرمان وەرگرتن؟

أ- پێم خۆش نییە. ب- ئاساییە بە مەرجێك شیاو بێت. ج- هەرگیز رێگری ناکەم.

٧- حەز دەکەیت کارەکان بە چ شێوازێك بڕوات؟

أ- رۆتینی بێت. ب- بەشێوازی خۆم. ج- پابەندی شێوازێکی رێکخستنی کار بم.

٨- لە پڕ هاوڕێیەکت کە بەدرێژی ساڵانی کار هاوڕێت بووەو هاوپلەی کار کردنیشت بووە، بەرزکردنەوەی پلەی بۆ ئەنجامدرا، هەڵوێستت چی دەبێت؟

أ- دڵتەنگ دەبیتو پێت ناخۆشە. ب- گلەییەکانت بە شێوازی وروژاندنی پرسیار دەردەبڕیت. ج- بە ساردیی پیرۆزبایی لێ دەکەیت.

٩- ئایا هیچ کات ویستوتەو چاوەڕێت کردووە ببیتە بەڕێوەبەری کارەکەت؟

أ- بەڵێ. ب- خۆزگەم خواستووە ئەم خەونە بێنمە دی. ج- بەو رادەیە بیرم لەوە نەکردۆتەوە.

١٠- هیچ کات چالاکییەکی کۆمەڵایەتیت رێکخستووە، بۆ نموونە لەگەڵ دراوسێکەتان؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر بەڵام لەوانەیە لەمەودوا کارێکی وا بکەم. ج- نا پێم خۆشە ئەم جۆرە کارانە لێگەڕێم بۆ کەسانی تر.

١١- کاتێك قوتابی بوویت، وا بووە تۆ پێشەنگی پۆلێك بوو بیت؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر بەڵام هاوکاری مامۆستام کردووە بۆ رێکخستنی پۆل. ج- نەخێر.

١٢- ئایا وا دەبینیت شێوازێك یان شتێك هەبێت تۆ داتهێنا بێت؟

أ- بەڵێ. ب- لەوانەیە. ج-نەخێر.

١٣- ئایا کارێك جێ دەهێڵیت ئەگەرچی بەردەوامی هەیە، بەڵام بواری پلە بەرزکردنەوەی تێدا نییە لە پێناو کارێك کە پلەبەندی هەیە ئەگەرچی ئەگەری بەردەوامیو ترسناکی تێدا زیاترە؟

أ-بەڵێ. ب-دڵنیا نیم. ج- نەخێر.

١٤- پێت وایە خەڵکی هەموو وەکو یەکن لە پایەی کۆمەڵایەتیدا؟

أ- نەخێر. ب- تارادەیەك. ج- بەڵێ، من پشتگیری لە نەمانی چینگەرایی کۆمەڵایەتی دەکەم.

١٥- سەردانی کەسانی خاوەن دەسەڵات دەکەیت؟

أ-نەخێر. ب-هەندێجار. ج- بەڵێ.

١٦- هیچ کات هەڵمەتێکت رێکخستووە لە دژی شتێك باوەڕت پێی نەبێت، یان دژی رای تۆ بوو بێت؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر بەڵام بەشداریم کردووە. ج- نەخێر.

١٧- پێت وایە رابەری بەهێز پێویستە لە سەدەی بیستویەکدا؟

أ- بەڵێ هەمیشە سەرۆکێکی بەهێز پێویستە. ب- شتێکی باشە ئەگەر میللەتیش هۆشیار بێت. ج- نەخێر.

١٨- ئایا کەسانێك هەن لە دەرەوەی بازنەی بنەماڵەکەت بێنە لات بۆ وەرگرتنی ئامۆژگاری؟

أ- بەڵێ هەمیشە. ب- هەندێجار. ج- هەرگیز یان زۆر کەم.

١٩- هیچ کات بیری گرتنە دەست یان بەرزکردنەوەی پلە لە دەسەڵاتدا خەوی تۆراندوی؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر. ج- بیرم لێ نەکردۆتەوە.

٢٠- لەگەڵ دەستەیەك لە هاوڕێکانت لە چێشتخانەیەکدا ئامادەن بۆ نانخواردن، دەبینیت خزمەتگوزارییەکانی درەنگ دەگەن، دەبێت ماوەی زیاتر لە کاتژمێرێك چاوەڕێ بکەیت، هەڵوێستت چی دەبێت؟

أ- پێشنیار دەکەیت هەمووتان شوێنەکە جێ بهێڵن وەکو نارەزاییەك. ب- لە شوێنی خۆت گلەیی دەکەیتو پاشان لە هاوڕێکانت دەپرسیت دەیانەوێ چی بکەن؟ ج- چاوەڕێ دەکەیت پێشنیارێك پێشکەش بکرێتو تۆش لەگەڵ ڕای زۆرینە بیت.

٢١- هیچ کام لە بۆنەیەکی خێزانی یان ئاهەنگی کۆکردنەوەی هاوڕێ دێرینەکانت ڕێکخستووە؟

أ- بەڵێ زۆرجار. ب- تەنها یەکجار. ج- هەرگیز.

٢٢- هەست بەچی دەکەیت کاتێك ڕەخنەیەکی توندت ئاراستە دەکرێت؟

أ- هەرگیز کاریگەری نییە بەسەرمەوە. ب- هەوڵ دەدەم دڵ تەنگم نەکات، ئەگەرچی هەندێجاربرینداریشم دەکات. ج- زۆر هەستیارم کارم تێ دەکات.

٢٣- کام لەمانە بە گرنگترین تایبەتمەندییە جیاکەرەوەکانی ڕابەر دادەنێیت؟

أ- بەهرەی سەرکردایەتی کردن. ب- هاندان. ج- هەبوونی ئەزموون.

ئێستا ئەو ژمارانە کۆ بکەرەوە کە بە دەستت هێناوە.

کۆی ژمارەو ئەنجام:

٠- ١٣ خەسڵەتە سەرەکییەکانت... لە خۆت رازیتو چالاکیت، بەڵام کەسێکی بێ ئاواتیت.

١٤ -٣٢خەسڵەتە سەرەکییەکانت... خاوەنی ویژدانێکی زیندوو هاریکارو ئارامگریت، هەروەها فەلسەفیانە بیر دەکەیتەوە.

٣٣ - ٤٨خەسڵەتە سەرەکییەکانت... ئاواتی زۆرت هەیەو لێهاتووی لە ڕابەرایەتی کردنو سووریت لەسەر ویستو خواستەکانتو توانای خۆگونجاندنت هەیە.

سەرچاوە:
www.maharty.com

# چۆن دامەزراوەکەت پێش دەخەیت؟

زنجیرەی یەکەم
ئا: ئاوات جەمال

## چەند پێوەرێك بۆ هەڵسەنگاندنی فەرمانبەرەکانت

وەك بەڕێوەبەر کە بەرپرسیارێتی سەرکەوتنو پێشکەوتنی دامەزراوەکەت لە ئەستۆدایە، هەڵسە بە ئەنجامدانی کاری هەڵسەنگاندنی فەرمانبەرەکانت تا بزانی ئایا ڕەزامەندن لەو ڕێنماییو ڕێوشوێنانەی کە بۆت داناون، بۆ ئەوەی ئەم کارە بەسەرکەوتوویی ئەنجام بدەیت دەبێت زۆر نهێنی بێت لە نێوانیاندا، ئەمەش لە جیاتی گفتوگۆکردنو ئاڕاستەکردنی ئەم پرسیارانە دەبێت:

١- هەست بە لایەنگری دامەزراوەکەت دەکەیت؟

٢- تا چەند ئەو بیروبۆچوونو پێشنیارانە قبوڵ دەکەیت کە دەبنە هۆی بەرەو پێشچوونی دامەزراوەکەت؟

٣- هەست بە پاڵپشتی کردنی دامەزراوەکەت دەکەیت بۆ فێربوونی شێوازو داهێنانی نوێ؟

٤- پیشەکەت بووەتە هۆکاری گۆڕانکاری نوێ لە خۆتدا کە ببێتە هۆی زیاتر کردنی شارەزاییو لێهاتوویت لە کارەکەتدا؟

٥- هەست دەکەیت کارەکەت بە گرنگی پێدانەوە ئەنجام دەدەیت؟

٦- بەڕێوەبەرەکەت بەلایەوە گرنگە کە ئایا لە کارەکەتدا خۆشحاڵیت یان نا؟

٧- ئایا فەرمانبەران لێرەدا گرنگن هەروەك چۆن بەرهەم گرنگە؟

٨- ئەو پێوەرانەی کە کارگێڕی باڵا دامەزراوەکە دایناوە لەبارەی جۆرو چۆنیەتییەوە پێوەری گونجاون؟

٩- پشتگیریو هاندانی باشت لێ دەکرێت تا زیاتر بەرپرسیارێتی هەڵگریت؟

١٠- تا چەند پاداشت دەکرێت لەبەرامبەر زیادکردنو باشتر کردنی ڕێژەی بەرهەمهێنان؟

١١- بڕی موچەکەت گونجاوە لەگەڵا ئەو کارەی کە ئەنجامی دەدەیت؟

١٢- قورسو گرانی کارەکان بە پێی پسپۆڕیو لێهاتوویيو لێپرساوێتی بە شێوەیەکی دادپەروەرانە دابەشکراون؟

١٣- ڕاهێنانو مەشقی پێویستو گونجاوت پێکراوە تاکو بەشێوەیەکی باشو لێهاتووو ڕەزامەندانە کارەکانت بە ئەنجام بگەیەنیت؟

١٤- لەبەرامبەر ئەنجامدانی کارەکانت بەشێوازێکی باشو لێهاتووانە سوپاسو پێزانین وەردەگریت لە لایەن بەڕێوەبەرو سەرۆك کارەکەتەوە کە مایەی ڕێز بێت؟

١٥- لە بەرامبەر کەموکوڕییەکانت ڕەخنەت ئاڕاستە دەکرێت، ئایا ڕەخنەکان بە شێوازێکی ڕێكو پێكو بەجێن؟

١٦- هەست بەخۆشی دەکەیت کاتێك داوای هەڵسەنگاندنو راوبۆچوونی تۆ دەکرێت دەربارەی ئەنجامدانی کارێك یان دەرکردنی بڕیارێك؟

١٧- تا چ ڕادەیەك بە ڕاشکاوی ڕووبەڕووی کێشەکانی دامەزراوەکەت دەبیتەوە؟

١٨- ئەو شوێنەی کارەکەتی تیادا ئەنجام دەدەیت، ئایا فراوانی ڕووبەرەکەیو پلەکانی گەرماو سەرچاوەی ڕووناکی سەرچاوەی ڕووناکییەکەی گونجاون؟

١٩- بە شێوەیەکی گشتی هەست بە ئاسوودەییو بەختەوەری دەکەیت لە کارەکەتدا؟

٢٠- بە بۆچوونی تۆ ئەم ڕاوێژ پێکردنو ئاڕاستەکردنی ئەو پرسیارانە دەبێتە هۆی باشتر کردنو بەرەو پێش بردنی بارودۆخی دامەزراوەکە؟

جا ئەگەر وەڵامی زۆربەی ئەم پرسیارانە نەخێر بوو، کەواتە فەرمانبەرەکانت نارازین لە ڕەوشی کارەکەیانو بارودۆخی دامەزراوەکەت.

بۆیە دەبێت دانبنێیت بەو هەڵەو کەموکورتیانەی کە لە ئەنجامی ئەم پرسو ڕاوێژکردنەوە بۆت دەردەکەونو هەوڵی چارەسەرکردنو کەمکردنەوەی ئەو خاڵە لاوازانە بدە کە دەبنە کۆسپ لە بەردەم باشترکردنو پێشکەوتنی دامەزراوەکەت.

به مەبەستی پەروەردەکردنی نەوەیەکی خاوەن بڕیار، بۆئەوەی منداڵەکانمان لە سەرەتای ژیانیانەوە لەسەر کارگێڕیو ڕێکخستنو شارستانییەت پەروەردەبن، بەشێکی نوێمان لە گۆڤارەکەدا بە ناونیشانی (بڕیاری منداڵان) کردەوە بەو هیوایەی لە داهاتوودا ببێتە گۆڤارێکی سەربەخۆ.

جا هەر بەڕێزێکی قەڵەم ڕەنگین ئارەزووی بەشداری دەکات با بابەتەکانی ئاراستەی ئەم گۆشەیە بکات لە ڕێگای بەڕێز: موحەمەد مێرگەیی یەوە بەم ئیمەیڵەی خوارەوە....
muhamada4@yahoo.com

بەڵام پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکەن کە ئەم بەشە جیاوازە لەبەشی پەروەردەو نوسینەکانی (بڕیاری منداڵان) ڕاستەوخۆ ئاراستەی منداڵان دەکرێت نەك پەروەردەکاران.






# (هانا) فێری خوێندنەوە دەبێت!

کاتێك کیژۆڵە هەنا توانی فێری خوێندنەوە ببێت، خێزانەکەی زۆر دڵخۆشبوون، باپیرەو داپیرەی کۆمەڵێك کتێبیان بۆ هێنا کە پڕبوون لە چیرۆکی خۆش، دایكو باوکیشی چوونە لای کتێبفرۆشی گەڕەکەیانو ئەوانیش کۆمەڵێکی تری کتێبیان بۆ کڕی کە پڕبوون لە باسی ئاژەڵانو چیرۆکی شازادەکانو بەسەرهاتەکانی دەریا. هەنا هەموو کتێبەکانی خوێندەوە، بەمەش زۆر دڵ خۆشبوو.

شەوێکیان لەو کاتەی ئەندامانی خێزانەکەیان پێکەوە شەویان بەسەر دەبردو گفتوگۆیان دەکرد، هەنا کتێبێکی هێناو لاپەڕەی یەکەمی کردەوەو گوتی: ئەرێ، یەکێك لە چیرۆکە خۆشەکانتان بۆ بخوێنمەوە؟

هەنا ئەم پرسیارەی لە هەموویان کرد، ئەوانیش وەڵامیاندایەوەو گوتیان: بەڵێ بە خۆشحاڵییەوە.

پاشان هانا دەستی بە خوێندنەوە کرد...
(دەگێڕنەوەو دەڵێن ڕۆژێك لە ڕۆژان....)
هەنا لە خوێندنەوەی چیرۆکەکەی بەردەوامبوو تاوەکو هەمووی خوێندەوە. دیسان هەنا پرسیاری لێکردنەوەو گوتی: دەتانەوێت گوێتان لە چیرۆکێکی تر بێت لەبارەی (سندباد)ەوە؟

بەر لەوەی ئەوان وەڵامی بدەنەوە، هەنا دەستیکردەوە بە خوێندنەوەی چیرۆكو بە سەرهاتەکانی (سندباد)و گەشتەکانی بە جیهاندا.

کاتژمێر لەدوای کاتژمێر بەسەرچوو هەتا وای لێهات هەنا تێبینیکرد دەنگی هیچ ئەندامێك لە ئەندامانی خێزانەکەی نابیستێت!

ئیتر کە هەنا بە هێواشی ئاوڕیدایەوەو سەیری کردن، دیتی وا هەموویان خەویان لێکەوتووە!؟

سەرچاوە/ گۆڤاری ئەلیکترۆنی (نبیل).






محمد مێرگەیی

# منداڵانو سێ هەنگاو بۆ چارەسەری ناکۆکییەکان

هاورێیان ئایا دەزانن بۆچی کێشەو ناکۆکییەکانمان زیاتر لەگەڵ خوشکو برایەکانمان دایە، نەك لەگەڵ هاورێکانمان؟ ئەمە شتێکی سروشتییە، چونکە ئێمە ڕۆژانە کاتێکی زیاتر لەگەڵ ئەواندا بەسەردەبەینو زیاتریش لەگەڵیاندا هەست بە خۆشیو پشوودان دەکەین، ئەمانە دوو هۆکاری سەرەکین.

بابەتی کێشەو ناکۆکی لە نێوان خوشکو برادا، کارێکی سروشتییەو هەموومان پێیدا تێپەڕدەبین، زۆرجار لەگەڵیاندا دەکەوینە ناکۆکیو دوای چەند خولەکێك یان چەند کاتژمێرێك ئاشت دەبینەوە، ئەمە کارێکی نامۆ نییە، بەڵکو لە هەمووماڵێکدا ڕوودەدات، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ڕێگەمان پێدراوە ناکۆك بینو بەشێوەیەکی بەردەوام دووبارەی بکەینەوە، هەروەها بە شتێکی ئاسایی بزانین. ئەگەر هەموو ڕۆژێكو بەشێوەیەکی بەردەوام بێت، ئەوا ئەم ناکۆکییە دەبێتە سەرچاوەی دلگرانیو هەراسانکردنی دایكو باوكو براو خوشکەکانی ترمان، کاتێکیش ناکۆکی نێوانمان دەگاتە ئاستی شەڕوپێکدادان، ئەمە کارێکی تەواو ڕەتکراوەیە، ئینجا لەگەڵ هەر کەسێکدا بێت.

ئەگەر دەتەوێت بە هەمیشەیی ناکۆکی لەگەڵ خوشكو براکانت یان هەر کەسێکی تر دووبارە نەبێتەوە، ئەوا پێویستە ئەم سێ هەنگاوە گرنگە پەیڕەو بکەیت:

یەکەم/ دان بە خۆتدا بگرەو بە ئارامبە، ئەمە گرنگترین نهێنییە، تاکو ناکۆکی دووبارە نەبێتەوە، چونکە زۆر لە منداڵانو مێرمنداڵان وادەکەن کە گرژیو تووڕەیی بەسەریاندا زاڵبێتو ئەوان بەسەریدا زاڵنابن، گریمان براکەت قسەیەکی پێگوتی کە تۆ بەدڵت نەبوو، ئەویش مەبەستی نەبوو هەستت بریندار بکات. لەمبارەدا زاڵبوون بەسەر تووڕەییو ئارامگرتنو بەرەنگاربوونەوەی هەڵوێستەکە بەشێوازێکی جوان یارمەتی لایەنی دووەم دەدات هەست بە هەڵەکەی بکاتو بە خۆیدا بچێتەوە، بەمەش ناکۆکیو ناخۆشی دروست نابێت.

دووەم/ ئەگەر پێویستیت پێ هەبوو داوای یارمەتی لە گەورەکان بکە، بەڕاستی ئەمە کارێکی جوانە ئەگەر بتوانین هەر خۆمان ناکۆکییەکانی خۆمان چارەسەربکەین بەبێ ئەوەی پەنا ببەینە بەر ئەوانەی لە رووی تەمەنەوە لە ئێمە گەورەترن، بەڵام لەوانەیە لەمجۆرە کارانەدا پەنابردنە بەر گەورەکان سوودی هەبێت، چونکە لەوانەیە ئەوان چەند یاسایەکمان بە سەردا بسەپێنن، بۆ نموونە وەکو ئەوەی پێمان بڵێن بە هەموو شێوەیەك شەڕو پێکدادان قەدەغەیە، یاخود ناوو ناتۆرەی گاڵتەجاڕییانە ڕێگەیان پێنادرێت، هەروەها یاساکانی ماڵەوەمان بیردەخەنەوە، لەوانەش ئەو یاسایەی ڕێگەمان پێنادات بەبێ لە دەرگەدانو رووخسەت وەرگرتن بچینە هیچ ژوورێك، ئەمە دەبێتە مایەی ئەوەی سنوورێك بۆ ناکۆکییەکانمان دابنێتو نێوانمان هێوربکاتەوە.

سێیەم/ تۆ خۆت لە جێگەی کەسی بەرامبەر دابنێ، بەڵام ئایا ئەمە چۆن دەکرێت؟ لەمەودوا کاتێك لەگەڵ هەر یەکێکدا ناکۆکیتان دەبێت، هەموو شتێك رابگرەو وەها خەیاڵ بکە تۆ لە جێگەی کەسی بەرامبەریت، بەڵێ خۆت لە جێگەی ئەو دابنێو خەیاڵی ئەوە بکە بە هەمان هەڵوێستی ئەودا تێدەپەڕیت، ئایا هەڵوێستو هەستی تۆ چی دەبێت؟ هەروەها ئەویش بە هەمان شێوە با خۆی لە جێگەی تۆ دابنێتو هەمان بیروخەیاڵ بکات، ئەمە یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتنی ناکۆکییەکەو چارەسەرکردنەکەی.

سەرچاوە: گۆڤاری (العربی الصغیر) ژمارە ٢٥ ساڵی ٢٠٠٩.

کێشە و بڕیار

م. ڕیباز محەممەد صادق

# کێشەیەکی ڕاستەقینە سەبارەت بە هاوردەکردن لە چینەوە!



زۆربەی بازرگانی ئێمە روو لە وڵاتی چین دەکەن بۆ هێنانی کاڵا، هەست دەکەم زۆر کێشە رووبەڕوومان بۆتەوە لەو وڵاتەدا، سەرەکی ترینیان دەست برینە ئێستا وام لێ هاتووە ئەگەر خۆم کاڵاکان فەحس نەکەمو هەرخۆم تەسلیمی کۆمپانیای گواستنەوەی نەکەم وا ئەزانم گەورەترین زەرەر چاوەڕێمە، ئەوان ساختەکارن لەجۆری ماددەکەو لە مەوعیدی وەرگرتنو لە هەمووشتێك گەر بۆیان بکرێ درێغی ناکەن. ئەتوانم بڵێم [ ٪٩٠] ی ئەو بازرگانانەی وڵاتی ئێمە کە خۆیان کاڵا دەکڕن گیرۆدەی ئەوەن، ئەوەش ماقوڵ نییە بۆکڕینی کاڵایەکی کەم دیسانەوە سەفەرێکی یەك مانگی چین بکەینەوە.

ئەم حاڵەتە نەك هەر من بەڵکو چەندین هاوپیشەی من پێوەی دەناڵێنێ، برادەرێکم کاشی سیرامیکی کڕیبوو لە شاری [ یو ]، لە دوای گرێبەستەکە پارەی لە کاتی خۆیدا دابوو بە کۆمپانیا چینییەکە، بەڵام دوای [٦٧] رۆژ کە بارەکە گەشتبووە [ هەولێر]، دەرکەوتبوو کە [ ٪٣٠]ی کاشییەکە بە شکاوی بارکراوە، لە کاتێکدا خەڵکی تریش هەیە تا ئێستا چینی نەدیوە، بەڵام ئاگادارم مامەڵەی لەگەڵ چینییەکاندا هەیەو پارەیان بۆ حەواڵە دەکات، دوای ئەوەی دەگاتە سلێمانی فەحسی ماددەکان دەکات، زۆر دڵنیام لەوەی کە سەد یەکی من توشی فشاری دەروونی نەبووە، وەك منیش مەسرەفی رێگای نەکردووەو دەتوانێت بەنزمتر لە نرخی من لە بازاڕدا بیفرۆشێ. ئاگادارم ئەو پێنج وەجبە کاڵای بۆ هاتووە، من سێ جار هەمان جۆر کاڵام کڕیوە گەر هەرسێ جارەکە خۆم فەحسم نەکردبا، بێگومان زەرەرم دەکرد، بەهۆی خراپی بەرهەمەکەوە، بەڵام ئەو لێرە لەگەڵ گەیشتندا بۆ سلێمانی یەکسەر ئەیفرۆشێ بێ فەحسو بەبێ ترس لە خراپی کاڵاکە.

نازانم نهێنییەکە چییە؟ چۆن لەو کێشە دەرونییە رزگارمان بێت؟ چۆن بتوانین رێگاکان کورت بکەینەوەو بێسەر ئێشە بین؟

## چارەسەر:

ئەو تەوەرانەی باست کردوون لە نێو کایەی بزنسی ئێمەدا بۆتە تەنگژەیەکی گەورە بۆ سەرمایەدارە ناوەندەکانو تازەکان زۆر جار نەك هەر بە زیانی خۆیان بەڵکو بە شڵەقاندنی بازاڕەکە ئەو کارە کۆتایی دێت، هەر وەك ئەو کاتەی کە گەنجەکانمان لە ئەوروپاوە رەنجی شانی خۆیان دەکردە پارەو دەیانناردەوە بۆ کەسوکاریان تا پارچە زەوییەك یان دوکانێکی پێ دەکردرا، زۆر پەلەی تێدا دەکراو چەند جار پارەی زۆر زیاد دراوە بە نرخی شتێکدا کە تەنها شیرزەیی پاساو بووە بۆی.

هەمان ئەو سیناریۆیە ئێستا دووبارە دەبێتەوە، بەڵام کەسەکانو ژمارەکانو فاکتەرەکانی گەشتن بە هەمان ئەو کۆتاییە جیاوازە، بە بۆچوونی منیش هۆکاری تەوزیف نەکردنی سەرمایەی سەرمایەداران دەگەڕێتەوە بۆ لێڵی نیگا کردنی پیاوانی کارمان بۆ داهاتوو، نابێ ئەوەشمان بیر بچێت کە زۆربەشیان کاری زۆر باشیان ئەنجامداوە، بە حوکمی نووسینەکەت دیارە بەڕێزت کەسێکی هەڵسوڕاویو خۆت کارە ئیجابییەکانیش دەبینیت.

یەکەمجار کەئەم گۆشەیەمان دروست کرد، بۆ ناساندنی گۆشەکە نووسیم (بیرۆکەی ئەم گۆشەیە لە گۆڤاری -عالم الادارە- وەرگیراوە کە لە هەشتاکاندا پەخش دەکرا، بەڵام ئێستا بە دیکۆرێکی کوردانەوە)، رەنگە بەهۆی هەڵەیەکی تەکنیکییەوە ئەو سەرەتایە بڵاو نەکرابێتەوە، ئەو شێوازە بۆ میدیای کوردی لە وانەیە تازە بێت، بەڵام بیرۆکەکە لەو سەرچاوەیە وەرگیراوە کە ئاماژەم پێکرد.

ئەو پرسیارەی کە بەڕێزت کردووتە بۆ ئاشکرابوونی نهێنی ئەو کەسەی کە بەبێ سەرئێشەو دڵەڕاوکێ کاڵاکەی دەگاتە دەستی لە کوردستان، مەرج نییە ئەو جۆرە خاترجەم بێت کە تۆ باسی دەکەیت، بەڵام لەوانەیە یەکێك لە خاڵەکانی سەرکەوتنی ئەو، شاردنەوەی خاڵە لاوازەکانی خۆی بێت.

بە نیسبەت ناڕاستی بەرامبەرەوە ئاساییە، نەك تەنها لەچین بەڵکو لە هەر سوچێکی دونیادا کەسی فێڵباز بەرەو رووت بێت، چونکە فێڵ کردن شتێکی نوێ نییە، بۆ ئەوروپاش پێویستە هەمان ترس هەبێت لە بەرامبەر، لە کاتێکدا ئەگەر کۆمپانیایەکی متمانە پێکراو نەبێت، هاوڕێیەکم باسی لەو ئەزموونەی خۆیکرد لەگەڵ پیاوێکی ئیتالیدا، ئیتالییەکی رێك پۆشو نووسینگەیەکی گەورەی لە ئاپارتومانێکی دەنهۆمیدا هەبوو، ئەم هاوڕێیەم ویستبووی مەکینەی ئایسکرێمی لێ بکڕێت، مستەر جولیانۆ پێی وتبوو: کارگەیەکی نوێم هەیە ئێستا لە کاردایە گەر دەتەوێت بابچین سەیری مەکینەکانی بکەین، ئەگەر بە دڵت بوو پارەکە بخەرە سەر حسابەکەم لە بانکو منیش مەکینەکانت بۆ رەوانە دەکەم، پێکەوە چووبوون بۆ سەیری کارگەکە، هاوڕێ کوردەکە ئەوەی لای جولیا نەدرکاندبوو کە ماوەی دوو ساڵ لە ئیتالیا کاری کردووەو زمانی ئیتالی دەزانێت، لە کارگەکە جولیا بە بەڕێوەبەری کارگەکەی وتبوو: ئەم هاوڕێیەم هێناوە دەیەوێت کارگەیەکی ئاسکریمی بۆ بکرم، بۆ ئەوەی فکرەیەکی هەبێت لەسەر ئیشەکە هێناومە ئێرە ببینێ، لەملاشەوە وای پیشاندا بوو کە خۆی خاوەنی کارگەکەیەو دەیەوێت بیفرۆشێ! کوردەکەی خۆمان!

بەگشتی بۆ ئەو کەسانەی خۆیان شمەك هاوردە دەکەن لە بازاڕەکانی دەرەوە سەرنجیان بۆ چەند خاڵێك رادەکێشم:

١- مەرج نییە ئەوەی رێك پۆش بوو، دەروونیشی رێك بێت، زۆر ئاساییە کە ئەو پیاوە سپۆرتە بەرێزە، سبەی گەورەترین ساختەکار بێت.

٢- بزنس کارت یەکێکە لەو هۆکارانەی کە بە هۆیەوە دەتوانیت بەدوای راستییەکاندا بچیت، بەم شێوەیە:

أ- سەرەتا بۆ ناوی کۆمپانیاکە پێویستە ساغکردنەوەی تەواو بکەیت، ئایا هەیە یاخود وەهمی یە؟ ئایا لە لایەن دەوڵەتەوە رێپێدراوە؟ یان تەنها لەسەر کارتو کەتەلۆگ ناوی هەیە؟

باشترین رێگەش لە وڵاتی خۆتەوە باڵیۆز خانەیە، لە ناو چینەوە دەزگا فەرمییەکانی تایبەت بەو بوارەیە، وەك ژوورە بازرگانییەکان.

ب- ژمارەکانی پەیوەندی کردن: مەبەست لێی تەلەفۆنو فاکسو ئیمەیڵو ئەدرەسە، پێویستە ساغکرێتەوە ئایا ژمارەی تەلەفۆنەکە وەهمییە؟ یاخود راستییەو تایبەتە بە کۆمپانیاکەوە، لەوانەیە ژمارە تەلەفۆنی ماڵی خۆیانی لەسەر کارتەکەی دانابێ، ئایا ژمارە تەلەفۆنەکە لەگەڵ ئەدرەسی ئەو شارەدا یەکن کە لە کارتەکەدا هەیە؟ هەروەها پێویستە ئەدرەسی تەواو لەسەر کارتەکە هەبێت بە ژمارەی بیناو کۆڵانو ناوی گەرەكو ناوچەکەو پاشان شارەکە، نەك تەنها بنووسێ: (جەبەل عەلی- دوبەی- ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی).

ج- ئەو سایتەی بە کاری دێنێ تایبەتە بە کۆمپانیا خۆی یاخود لە سایتە خۆڕاییەکانە، هەرچەندە چینییەکان بە زۆری سایتە خۆڕاییەکان بە کاردێنن، بەڵام کۆمپانیای جددی سایتی تایبەت بە خۆی هەیە.

٣- ئەو نرخەی کەسی ساختەکار دەیدات زۆر جیاوازە لە نرخی راستەقینە، بۆ نموونە جیاوازییەکە زیاتر بێت لە ٤٠٪، ئەوە بە زۆری ساختەیە، چونکە مومکین نییە بە هەمان ماددەی خاو، هەمان بەرهەم بەڵام نرخێکی بەو جۆرە کەم هەبێت بۆ کاڵاکە.

٤- مەرجەکانی پارەدانو وەرگرتنی کاڵاش ناڕاستەوخۆ راستیو دروستی مامەڵەکەت بۆ دەردەخەن، کەسی بەرامبەر گەر نییەتی پاك بێت، ناتوانێت بەشێوەی (L/C) پارە وەربگرێت، ئەو هەوڵ ئەدات پێش بارکردنی کاڵاکە پارەی خۆی وەربگرێت.

٥- ئەو پرۆفۆرمەی بۆ گرێبەست ئامادە دەکرێت، پێویستە زۆر زانیاری وردی تێدا بێت سەبارەت بە جۆرو کێشو شێوەو هەر پێوانەیەکی زانستی کە بەسەر کاڵاکەدا بچەسپێ، ژمارەی داواکراو، کێشی گشتی، قەبارەی گشتی، ژمارە لە هەر کارتۆنێکدا -ئەگەر کارتۆن بوو- چۆنیەتی پارەوەرگرتن ئایا بە کاشە یان بەشێوەی (L/C) ئەو کۆمپانیایانەی کە بەشێوەی دروست مامەڵە دەکەن، بە جۆرێك روونی دەکەنەوە کە هیچ پرسیارێکی جەوهەری لای کڕیار نامێنێت لەسەر گرێبەستەکە، بەرادەیەك بوار دەدات بە کڕیار کە بۆ نموونە لە ماوەی (١٠) رۆژدا لە دوای ئامادەبوونی کاڵاکەوە کڕیارەکە دەتوانێت خۆی بچێت بۆ پشکنینی بەرهەمەکە پێش بارکردن، گەر لەو ماوە دیاریکراوەدا کڕیار ئامادە نەبوو بۆ پشکنین ئەوا رۆژانە کرێیەك دەخرێتە سەر کاڵاکە کە لە کۆگای کۆمپانیاکەدایە، تاوەکو کڕیار بە زووترین کات پشکنینەکەی ئەنجام بدات، یاخود رەزامەندی نیشان بدات بۆ بارکردنی کاڵاکە بەبێ پشکنین.

لەم چەند سەرنجەوە ئەتوانم وەڵامی ئەوەت بدەمێ کە جۆری ئەو کۆمپانیایەی بەڕێزت مامەڵەی لەگەڵ رێك دەخەیت راددەی خاتر جەمی تۆ دەردەخات، لە ئەنجامی بە دواداچووندا بۆم دەرکەوتووە ئەو بازرگانانەی ئێمە کە دەچنە وڵاتی چین زۆربەیان مامەڵە لەگەڵ خەڵکی بازاڕدا دەکەن نەك لەگەڵ کۆمپانیا بەرهەمهێنەکە، ئەمەش جۆرێکە لە موجازەفەو لە ئەنجامدا زەرەری لێ دەکەوێتەوە، لە لایەکی ترەوە مامەڵەی کڕینو گرێبەستمان لەگەڵ کۆمپانیاکانی دەرەوەدا زۆر ناڕێکە، لە راستیدا پێویستە ئەوان لە رێگەی بانکەوە حەواڵە بکەنو کۆپییەکی گرێبەستەکە بدەنە بانك، نەك حەواڵەی بکات بۆ نووسینگەیەکی حەواڵە کردن لە چینو ئەوانیش بەبێ هیچ زانیارییەك بیخەنە سەر حیسابی بابا چینەکە، چەندین خاڵی سلبی تریش هەیە کە لە دوو توێی ئەم پەڕەیەداو بەو خێراییە باس ناکرێت.

ئەگەر وەڵامەکەم پڕ بە پێستی پرسیارەکەی بەڕێزتە ئەوا زۆر خۆشحاڵم، ئەگەریش هێشتا تاریکی هەیە لە وەڵامەکەدا ئەوا دەرگا واڵایە بۆ هەر پرسیارێکی تر.

# بوارەکانی زانینی بازاڕسازی

هاژە شێروانی





## بەشی پێنجەم

### دووەم:- زانینی بەرهەم Product Knowledge

بەرهەم بە خوێنی ژیان دادەنرێت، کە پارێزگاری لە سەر مانەوەو نوێبوونەوەی ڕێکخراوەکان دەکات، بە گوزارشتکردن لەسەر توانای بەرهەمداریو بە بازاڕخستنو داهێنان، ئەمەش وادەکات کە بەرهەم زۆرترین شت بێت کە بەرهەم بهێنرێت، چونکە بەستراوەتەوە بە ئەرکێکی تر کە گرنگییەکەی کەمتر نییە لەسەر توانای بەرهەم هێنانی، هەربۆیە بەرهەم لە ژیانی ڕێکخراوە نوێیەکان بە پرۆسەیەکی فراوانو ئاڵۆز دادەنرێت هەر لە سەرەتای پرۆسەی گەڕان بە دوای ئایدیا نوێیەکە بۆ بەرهەمی نوێو دیزاینی شێوەکەو تایبەتمەندیو مۆدێلی یەکەمی تاقیکراوەی تاوەکو بەرهەم هێنانو ناردنە بازاڕو بە دواداچوونی پەرەپێدانی لە سوڕی ژیانی لەم بازاڕەداو تا دارمانو دەرچوونی لەم بازاڕەداو شوێن گرتنەوەی بە بەرهەمێکی تر.

لێرەدا دەتوانین پێناسەی بەرهەم بکەین بەوەی کە زاراوەیەکە گوزارشت دەکات لە کاڵا، خزمەت، ئایدیا، کە لە ڕێگایەوە دەتوانرێت پێداویستیو ئارەزوویەک پڕبکاتەوەو دەتوانرێت بە ئاڵوگۆڕ پێشکەش بکرێت، بەرهەمیش کۆمەڵێک بەهایە کە دەتوانرێت پێشکەشی کڕیارەکانی بکرێتو وا دەبێت کە بەرهەم شتێکی سادەی بینراو بێت، وەکو بەستەنی یاشتێکی تری ئاڵۆزو نەبینراو وەك پێکهاتن لەسەر کڕینی ڕێکخراوێك بە تەواوی. ڕێکخراوەکانیش لەم سەردەمەدا درکیان بەوە کردووە کە کڕیار پێشبینی لەوە زیاتر لە بەرهەم دەکات کە پێداویستییە سەرەکییەکانی پڕدەکاتەوە.

بۆ سەرکەوتنی بەرهەم باوکی کارگێڕی بە بازاڕخستن (Kotler) دووپاتی پێویستی بوونو بە بەهەند وەرگرتنی هەر پێنج ئاستەکە لە کاتی پلان دانان ڕەچاوی بکرێت:-

١- تیشك خستنە سەر سوودی ناوەکی کە بەرهەمەکەی لە پێناو دەکرێت.

٢- دەرخستنی سوودی ناوەکی لە بەرهەمە سەرەکییەکە.

٣- هەڵسان بە ئامادەکردنی بەرهەمی پێشبینی کراو ئەمەش لە ڕێگای کۆمەڵێك تایبەتمەندی کە کڕیار پێشبینی دۆزینەوەی دەکات لەو بەرهەمەو گونجانی لەگەڵ پێداویستییەکانی ئەو.

٤- پێویستە ئەو بەرهەمە بە شێوەیەك ئامادەبکرێت کە سوودێكو خزمەتێکی زیاتر ببەخشێتو جیابکرێتەوە لەوەی کە ڕکابەرەکان پێشکەشی دەکەن.

٥- پێشکەش کردنی بەرهەمی دەستکەوتوو، کە هەموو زیادەکارییەكو شێوەکارییەك دەگرێتە خۆی کە لە ڕێگایەوە بە شێوە کۆتاییەکەی دەردەچێت.

بەڵام هەرچی زانینی بەرهەمە، ئەوە زانینی تایبەتمەندی ئەدای هونەریو تایبەتمەندی کاڵاو خزمەتی پێشبینی کراو هەبووەو لە لای خۆیەوە زانینی دەستنیشان کردنی بەرهەم دەگرێتەوە، لە پێناو دوورکەوتنەوە لە هەر پروپاگەندەیەکی هەڵە، بە جۆرێك کە بەرهەم پێکدێت لە تایبەتمەندیو سوودو لە کاتی خستنەڕووی بۆ کڕیار پێویستە باسیان لێوە بکرێت بە مەبەستی هاندانی کڕیار بۆ کڕینی، بەڵام تایبەتمەندی بریتییە لە قەبارەو ڕەنگو کاریگەریو دیزاینو لەوانەیە کاتژمێری کارکردن یا خزمەتیش بگرێتەوە، بەڵام سوودەکانی بریتییە لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی کڕیار، چ سوودێك لەم بەرهەمە دەبینم.

بە شێوەیەکی گشتی هەر ڕێکخراوێك کە پێویستە زانیاری تەواوی هەبێت لە سەر ئەوەی بەرهەمی دەهێنێت بەم شێوەیەی خوارەوە:-

١- وەسفێکی تێروتەسەل لەسەر بەرهەمی ڕێکخراو (لە ڕوانینی کڕیار)، لێرەدا ڕێکخراو کار دەکات بۆ دانانی زانیاری لە سەر ناسینەوەی دیاریکراوی بەرهەمی ڕێکخراو، ڕێکخراو پێویستی بە تێگەیشتنی توانای بەرهەمەکانی هەیە لەسەر پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی کڕیاران، یان ئەو ناسینەوەیەی کە بەرهەمی ڕکابەری نییەتی، یان ئەو قۆناغەی کە بەرهەمەکە پێیدا

تێپەڕ دەبێت (بە واتای قۆناغی ئایدیا، یا قۆناغی دیزاین...... هتد).

٢- زانیاری سەبارەت بە سوڕی ژیانی بەرهەم، پێویستە لەسەر ڕێکخراو کە دڵنیا بێ لە دانانی زانیاری سەبارەت بە باری بەرهەمەکەی لە سوڕی ژیانیو سەرەڕای هەر فاکتەرێکی تر کە کاریگەری دەبێت لە سەر سوڕی ژیانی لە داهاتوودا.

٠٣ چالاکی گەڕانو پەرەپێدان: هەر پرۆسەیەکی ناوخۆیی، یان چالاکی داهاتووی تایبەت بە پەرەپێدانی بەرهەمە نوێیەکان دەگرێتەوە، بەو واتایەی کە پێویستە ڕێکخراو ئەمانەی خوارەوە دابین بکات:-

* زانینی پێداویستیو باشترینو تایبەتمەندی کڕیارو هەڵسوکەوتی.
* زانینی دەرفەتی بازاڕ.
* زانینی تایبەتمەندی بەرهەمەکان.
* زانینی چۆنییەتی بەکارهێنانی بەرهەم.
* زانینی جۆری بەرهەم.

گرنگی زانینی بەرهەم/

دەتوانین ئاماژە بە گرنگی زانینی بەرهەم بکەین جا چ سەبارەت بە ڕێکخراو یا کڕیار بێت لە ڕێگای ئەم خاڵانەی خوارەوە:-

١- زانینی بەرهەم وەکو بازنەیەکی سەرەکییە لە گەیشتن بە پرۆسەی پەیوەندی نێوان کڕیارو ڕێکخراو، بە واتایەکی تر پێویست بە پەیوەندی ناکات لە نێوان ئەم دوو لایەنە بەبێ بوونی شتێك کە کڕیار لە هەوڵی بە دەست هێنانییەتی، یا ڕێکخراو دەتوانێ پێشکەشی بکات.

٢- گرنگی دان بەم بازنە سەرەکییە (زانینی بەرهەم): لە لایەن کڕیار یا ڕێکخراو بە بێگومان بەشداری دەکات لە زیاد کردنی شوێنو پێگەی ڕێکخراو لە بازاڕ، لە دواییدا دەستخستنی قازانج وا دەکات کە بەردەوام بێت لە کارکردن.

٣- زانینی بەرهەم بەشداری دەکات بە ئاستێکی گەورە لە بنیاتنانی بواری پەرەپێدانی کۆمەڵایەتی لە لای تاکەکان، ئەمەش بە متمانە کردنە سەر ئەوەی کە نوێیەو ئاسانکاری لە پرۆسەی بەکارهێنان دەکات یا سوودمەندبوون بە شێوەیەکی باشتر، هەر بۆ نموونە بە کارهێنانی چێشت لێنەری کارەبایی یا غازی لە بری دار یا نەوت لە کاتی ئامادەکردنی خواردن... هتد.

٣- زانینی بەرهەم پێشرەوی پێداویستی مرۆڤ دەکاتو پڕی دەکاتەوە لە ڕێگای بەرهەم هێنانی ئەو شتانەی کە پێویستییەتی، ئایا بەم شێوەیە گرنگی زانینی بەرهەم دەردەکەوێت کە هەر پێداویستییەکی نوێی کڕیاران پڕدەکاتەوە.

# یاساکانی فرۆشتن

و: ئەمیر ئەحمەد عبدالقادر

یاسای ١/

فرۆشتن: لە جیهانی ئیشو کاردا هیچ شتێك ڕوونادات، تەنها ئەگەر کەسێك شتێك بە کەسێکی تر بفرۆشێت.

کاری پێویستو زیندوو بۆ بازرگانیو کاروبارەکان بریتییە لە تەواوکردنی پرۆسەی فرۆشتن، ئەم کارەش پێویستی بە هاندانی کڕیارەکان هەیە بۆ پێشکەشکردنی داخوازی کڕین. بەڵام زۆرینەی پیاوە فرۆشیارەکان دەڕۆن بەرلەوەی دەرفەتی ڕاستەقینە بە کڕیاری پێشنیارکراو بدەن بۆ ئەوەی بە کڕینەکە ڕازی بێت. بە کورتی بۆ ئەوەی بتوانی بفرۆشی، پێویستە داخوازی فرۆشتن ئاڕاستەی کڕیارەکان بکەیت.

یاسای ٢/

بڕیاردان: ڕادەی سوربوونو بڕیاردانت ڕێژەی سەرکەوتنت لە بواری فرۆشتن دیاری دەکات.

لە بواری فرۆشتنەکان ڕادەی سەرکەوتن کە بە شێوەیەکی مەزن پێی دەگەی دەکەوێتە سەر بیروبۆچوونەکانی ناوخۆیی زیاتر لە فاکتەرە دەرەکییەکانی تر. بۆئەوەی ببی بە باشترینو دەستهاتی زیاترت دەست بکەوێت، ئەو یاسایە لە بەرچاو بگرەو واز لەو چەمکو پێشبینیە ڕەشبینانە بهێنەو بە هەموو سۆزو خۆشەویستیت پێشوازی لە کارەکەت بکە.

یاسای ٣/

پێداویستییەکان: هەموو بڕیارێکی کڕین ئامانجی دابینکردنی پێداویستییەکە یاخود هێنانەدی ئامانجێکە، هەتاوەکو زانیاریت دەربارەی پێداویستییە ڕاستەقینەکانی کڕیاران زیاتر بێت، ئەوا زیاتر دەتوانی لە چۆنییەتی دانانی بەرهەمو خزمەتگوزارییەکانت لە بەردەمیان تێبگەی، وەکو باشترین ڕێگەچارە کە بەدوایدا دەگەڕێن. فرۆشیارە ناوازەکان بە زۆری بە ئاگاو هۆشیارن لە مەڕ پێداویستییەکانی کڕیاران.

یاسای ٤/

کێشەکان: بەرهەمو خزمەتگوزارییەکان وەکو چارەسەرێکی دیاریکراو سەیر بکرێن بۆ خودی کێشەو گرفتەکان.

کڕیاران بەرهەمێك دەکڕن، چونکە پێیان وایە گرفتەکانیان چارەسەر دەکات، نەك لەبەر خودی بەرهەمەکە خۆی، بۆیە فرۆشیارە زۆر چالاکەکان زیاتر پیشەیین لە پێشکەشکردنی بەرهەمەکانیان وەکو ڕێگە چارەیەك بۆ کێشەو گرفتەکانی کڕیاران.

یاسای ٥/

ڕازیبوون: ڕازیبوون لە فرۆشتن بریتییە لە هەوڵدانی سەلماندنی ئەوەی کە بەهای بەرهەمەکە زیاترە لەو نرخەی بۆی دیاریکراوە.

هەمیشە کڕیاران لە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەك بۆ زۆرترین ژمارەی پێداویستییەکانیانو بە هەرزانترین نرخ، کڕیاران هەست بە شادومانی دەکەن کاتێك دەزانن کەسانی تر توانیویانە ڕێگەچارەی جۆری بدۆزنەوە بۆ کێشەکان، ئەوە پاڵیان پێوە دەنێت بەرهەمو خزمەتگوزارییەکان پەسەند بکەن.

یاسای ٦/

ئارامیو ئاسایش: گرنگترین پێداویستییەکانی مرۆڤ، دەستەبەرکردنی ئاسایشی کەسێتیو دارایيو سۆزدارییە.

فرۆشیارە چالاکە ناوازەکان ڕاستەوخۆ لە دەروازەی پێویستی کڕیار بە ئاسایش دەچنە ژورەوە، بە هێنانەدی ئارامیو دڵنیابوون لێی، کڕیار هەست دەکات مەترسییەکان زۆرکەمتر بوونەتەوە ئەگەر مامەڵەت لەگەڵدا بکات، ئەوەش پاڵنەرێکی بە هێزە بۆ مامەڵەکردنی زیاتر.

یاسای ٧/

خۆ خستنە مەترسییەوە: هەمیشە هەرجۆرێك لە جۆرەکانی وەبەرهێنان مەترسی هەیە.

هەرگیز ناتوانیت لە مەترسییەکانی ژیان خۆ بەدوور بگریت، فرۆشیارە زرنگەکان ئەم ڕاستییە باش دەزانن، هەمیشە بەرهەمەکانیان وا دادەنێن کە بەرهەمێکی کەمتر مەترسیدارە، ئەوان هەموو کارێك دەکەن لە توانایاندا بێت بۆ کەمکردنەوەی چەمکی خۆ خستنە مەترسییەوە (بە بیروڕای کڕیار)و ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ دەکەن سەبارەت بە مەترسییەکانی، لە ئەنجامدانی هەڵەیەك لە ئەنجامی بڕیاری کڕین. لە کاتی پرۆسەی فرۆشتنەکە سەیری هەموو شتێك دەکرێت لە گۆشەی کەمکردنەوە یان زیادکردنی مەترسی لە پرۆسەی فرۆشتن، فرۆشیارە زیرەکەکان کار بۆ ئەوە دەکەنو بە تەواوی لێی تێدەگەن، هەرکارێك پێی هەڵدەستن ئامانجی پێدانی نیشانەیەکە بۆ کڕیار کە هەموو مەترسییەکان لەبەرچاو گیراونو هەموارکراون بۆ ئەوەی لە سنوری پێودانگەکانی ئارامیو ئاسایش دابن.

گۆڤاری: عالم الابداع/ژمارە (٣٠) ٢٠٠٧

# کچان و کوڕان لە نێوان ئازار و ئاواتدا





## ژیان گۆڕاوەو زەمانی زوو بەسەرچوو! ٢/١

زۆرجار گوێمان لێ دەبێت کە باوکو دایکی ئەم زەمانە گلەیی لە کوڕو کچەکانیان دەکەن، کاتێک بەراوردیان دەکەن لەگەڵ زەمانی خۆیاندا، هەست بە جیاوازییەکی زۆر دەکەن! بۆ نموونە دەڵێن: جاران منداڵان زێتر گوێڕایەڵی دایکوباوک بوونو لە مەجلیسی پیاواندا دادەنیشتنو لە ڕاپەڕاندنی کارو ئەرکەکانیاندا چالاکتر بوونو کەم تەکلیف ترو کەم گرفت بوونو ئەو هەموو سەر ئێشەیەی ئێستایان نەبوو، وێڕای گازندەی زۆر.

لە وەڵامی ئەو هەموو گازندانەشدا هەڵبەت بە هەموو دایکانو باوکان دەڵێین: کە ئێوە باسی زەمانی زوو دەکەن نەک ئێستا، چونکە ئێستا هەموو شتەکان گۆڕاون، ئەگەر لە هەر کام لە بوارەکانی ژیاندا بەراوردێك بکەین، دەبینین کە جیاوازییەکی زۆر هەیەو دەکرێت لە هەموو ئەو بوارانەشدا کۆمەڵێك گازندەو گلەیی زۆرمان هەبێت.

سەبارەت بە ژیانی هەرزەکاران، چ کوڕانو چ کچان، ئەو کات ژیان زۆر سادەو ئاسان بوو، پێویستییەکانی ژیان، داواکارییەکانی ئێوە، هەڕەشەو مەترسییەکان زۆر کەمتر بوون، پەیوەندییەکان، کاریگەری ڕۆشنبیرییە جۆربەجۆرەکان، ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نەبوو، جاران کوڕان لە تەمەنی مێرد منداڵیدا تەنها ئەوەندە بەس بوو بۆ پێهەڵدانیان کە ئیشکەرو بە ماریفەتو دەتوانن میوان بەڕێ بکەنو پێشوازیی لێ بکەنو لە مەجلیسدا دەمە تەقێ بکەن، کچانیش دەتوانن هاوکاری دایکیان بکەنو کاروباری ناوماڵ ڕاپەڕێنن!

دانیشتنی هەرزەکاران لە کۆڕو مەجلیسی گەورەکانیشدا بەس بوو بۆ فێربوونی دابو نەریتو ڕێو ڕەسمی کۆمەڵگاو فێربوونی کۆمەڵێك ئاکارو هەڵسوکەوت.

جاران زۆربەی شتەکان سنوردارو دیاری کراوبوون، هەر کەسەو لە کونجی قەناعەتدا خۆی بە کارێکەوە خەریك کردبوو، کە ژیانو گوزەرانی دابین دەکرد.

ئیتر حەزی دۆزینەوەو گەڕانو پشکنینو گۆڕانو دنیا بینین بە دەگمەن هەستی پێ دەکرا!

بۆ نموونە تا ئەم ساڵانەی دوایی زۆربەی لاوانی ئەم وڵاتە بە شارەکانی کوردستان ئاشنا نەبوون، ئەگەر بۆ خوێندن یا کارێکی زۆر پێویست نەبوا لاوێکی خەڵکی سلێمانی هەولێر یا دهۆکی نەدەدی، وە بە پێچەوانەشەوە!

بەڵام ئێستا ژیان وایکردووە، دەیان وڵاتی جیهانی تەی دەکاتو سەر بە هەزار کوندا دەکات!

سروشتی ژیانیش وەهایە لەگەڵ پێشکەوتنی ژیاندا مرۆڤ داواکارییەکانی زیاد دەکەنو داوای زیاتر دەکاتو بە شتەکۆنەکان چیدی ڕازی نابێتو شتی نوێی دەوێت، حەزو ئارەزووەکانی زیاد دەبنو بەرامبەر بەوەش ماندوو بوونو سەرئێشەش زیاد دەکات!

ئەمڕۆ جیهان زۆر بچووك بۆتەوەو خەریکە لە گوندیش بچوکتر دەبێتەوەو دەبێتە نیمچە دیوەخانێك کە تیایدا چەندین بیروڕای جیاوازو شتومەکی سەیروسەمەرەی تێدا نمایش دەکرێت!

جاران ئەگەر سەرچاوەی هەواڵو ڕۆشنبیریو سیاسەتو مەعریفەت تەنها ڕادیۆ، یا چەند کتێبێکو بە دەگمەنیش هەندێجار ڕۆژنامەیەك بوایە!

ئەمڕۆ هەزاران کەناڵی تەلەفزیۆنیو ڕادیۆییو سەدان ڕۆژنامەو بڵاوکراوەو هەزاران سایتی ئینتەرنێتە، کە لە توانای کەسدا نییە دەستی بەسەردا بگرێتو نەیەڵێت کاریگەری هەبێت بەسەر نەوەکانمانەوە!!

ئەمڕۆ لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێك خواردنو خواردنەوە بە گەرمی دەگوازرێتەوە، ئەمڕۆ دەتوانی لە ماڵی خۆتدا دابنیشیو بابۆڵەی کنتاکیو پیتزای ئەمریکی عافێت بکەیت!

کاتێك ئێمە سەرقاڵی دنیاو پەیداکردنی پارەینو پێشبڕکێمانە لە خانووی بەرزو ئۆتۆمبێلی مۆدێل نوێداو نەوەکانمان فەرامۆش کردووە، بە منداڵی تاکە مامۆستایان (ئەفلام کارتۆن بێت)و بە هەرزەکاریش فیلمی تورکیو ئەمریکیو هیندی، مافی ئەوەمان نییە، گلەییان لێ بکەین، کاتێك خۆمان بووینە مایەی سەرلێشێواویان!

ئەگەر ئێستا لە بری دیوەخانو مزگەوت ڕوو بکەنە قومارخانەو بارەکان، نابێت چاوەڕێی زانستو ماریفەتو مامەڵەی باشیان لێ بکەین!!

ئەگەر پەروەردە لای ئێمە تەنها دابینکردنی جێگاو ڕێگاو جلوبەرگو خۆراك بێت! نابێت نیگەران بین کاتێك دەبینین نەوەکانمان ئەلفو بێی ژیان نازانن!!

دنیا گۆڕاوەو لەگەڵ خۆشیدا زۆرێك لە سیستەمەکانی ژیانیشی گۆڕیوە، کاتێك ئێمە لە دەرەوەی سنوری بازنەی ئەو گۆڕانو پێشکەوتنەین، تەنها لایەنە خراپەکانیمان دەست دەکەوێت، ئەم گۆڕانە هەموو جیهانی داگرتووە بەڵام بۆچی بەسەر ئێمەدا بە خراپ شکاوەتەوە! پرسیارێکەو وەڵامەکەی دوادەخەین بۆ ژمارەی داهاتوو، هەموو خوێنەرێکیش مافی ئەوەی هەیە بۆ لێکۆڵینەوە لەم پرسیارە بە نووسین بەشداری بکاتو بۆ ئیمەیڵی سەرنووسەری ڕەوانە بکات.

# داهێنانی یەکەم سەماعەی پزیشکی

بەرزان ئەبوبەکر ڕەشید

لەسالّی (١٩١٦) پزیشکێکی فەرەنسی ناوی ( رینیە لینالّ) بوو، بانگهێشتکرا بۆ پشکنینی کچێکی فەرەنسی کە بەدەست ئازاری دلّییەوە دەینالاّند، کاتێك پزیشکەکە هات بۆ لای نەخۆشەکەو چاوی پێکەوت، سەرەتا ویستی پشکنینی بۆ ئەنجام بدات، ئەویش بەهۆی گوێگرتن لە لێدانەکانی دلّی، چونکە ئەو کات بواری پزیشکی بەشێوەیەکی ئەوتۆ پێشکەوتنی بەخۆیەوە نەدیبوو، بۆیە سەرەتا پزیشکەکە ویستی گوێ بنێ بە سنگی کچەکەوەو گوێ بیستی شێوازی لێدانی دلّی بێت، بەلاّم کچەکە رێگەی نەدا پزیشکەکە گوێی بنێت بە سنگییەوە، هەرچەندە پزیشکەکە زۆر هەولّیدا بەلاّم بێ سوود بوو، لەو کاتەدا رۆژنامەیەکی بینی لەسەر مێزەکە دانرابوو، پزیشکەکەش رۆژنامەکەی لەشێوەی لوولەکێکدا لوول کردو لایەکی لەسەرسنگی کچەکە داناو گوێی خستە سەر لاکەی تری رۆژنامەکە، لەو کاتەدا پزیشکەکە سەرسام بوو بەوەی زۆر بە روونیو ئاسانی گوێی لە لێدانی دلّی بوو، لێرەدا پزیشکەکە بیرۆکەیەکی بۆ هات کە بیر لە دروستکردنی سەماعەیەکی پزیشکی بکاتەوەو بۆ دواجار بیرۆکەکەی خستە قۆناغی جێبەجێکردنەوەو سەماعەیەکی داهێنا بۆ پشکنینی نەخۆش، ئەویش قۆناغ بە قۆناغ پەرەی سەند تا ئەوەی گەیشتە ئەو جۆرە سەماعەیەی کە ئێستا پزیشکەکان بەکاری دەهێنن، ئەوەش بزانە هەموو داهێنانێك سەرەتا بیرکردنەوەیەکی سادە بووە.

بێگومان هەموو داهێنانە پزیشکییەکان لە خزمەتی تێکڕای مرۆڤایەتیدان، گومانیش لەوەدا نییە کە هەمووان قەرزاری پزیشكو داهێنانە پزیشکییەکانین، ئەمەش زیادەڕەوی نییە لە وەسفیاندا بەلّکو راستییەکی بەلّگە نەویستەو هەموو مرۆڤێکی خاوەن ژیارو رۆشنبیر بە چاوی خۆی دەیبینێت، ئەگەر پێکەوە بەراوردێك بکەین لەگەلّ زۆرنا تەنها نیوسەدە لەمەوبەر ئەو کات بۆمان دەردەکەوێت کە مرۆڤایەتی بەگشتیو کورد بە تایبەتی لە سەردەمانێك کە پزیشكو داهێنانە پزیشکییەکان بوونیان بەو شێوەیەی ئێستا نەبووە، چۆن بوونەتە قوربانی ساکارترین نەخۆشیو رۆژانە بە هەزاران مرۆڤ بە هۆی نەخۆشییەکی زۆر سادەوە گیانیان لە دەستداوە، لەوانە (سورێژە، کۆکەڕەشە، ئاولّە،.... هتد، تەنانەت ریخۆلّە کوێرەش)، بۆ بیرهێنانەوەی خۆمان حەزدەکەم باس لە نموونەیەکی بچوك بکەم، ردێن سپییەك ئەم رووداوەی بۆ گێڕامەوەو وتی: (لە سالّەکانی پەنجادا کە ئەو کات من مندالّ بووم نەخۆشییەك روویکردە گوندەکەمان، پێیان دەگوت سورێژە، لە ناو خەلّکی گوندا واباو بوو دەیانگوت: -سورێژە بینێژە-! واتە هەر مندالّێك تووشی سورێژە دەبوو ئاکامەکەی بە مەرگی کۆتایی دەهات، ژمارەیەکی بەرچاو لە مندالاّنی گوند ئەو نەخۆشییەیان گرتو بەو هۆیەوە گیانیان لە دەستدا، ئەو لە درێژەی قسەکانیدا وتی: لەو کاتەدا بەشێك لە پیاوانی گوند بۆ ئالّوویرکردن روویان کردبووە شار، کاتێك گەڕانەوە چەند کیلۆمەترێك لە دووری گوندەکە چاویان بە من کەوت، ئەوان زیاتر لە مانگێك بوو رۆیشتبوون، خۆ ئەو کات تەلەفۆنو ئینتەرنێتو...هتد بوونیان نەبوو، تا لەو رێگەیەوە رۆژانە هەوالّی مالّەوەیانو گوندەکەیان بزانن، بۆیە زۆر بە پەرۆشەوە هەوالّیان لە من پرسیو وتیان: دەنگوباسی نێوگوند چییە؟ منیش وەکو وتم ئەو کات مندالّ بووم، نەمدەزانی هەوالّی ناخۆش چەند جەرگبڕو بە ئازارەو بەرامبەر چۆن دەهەژێنێ، بۆیە زۆر بە سادەیی وتم: تۆ فلاّن دوو مندالّت مردو تۆش مندالّێكو... بەوشێوەیە، کە وادەزانم کەسیان نەبوو لەو کۆمەلّە هەوالّی مەرگی یەکێك لە مندالّەکانی پێنەدەم، ئەوانیش بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە بەرەو گوندەکە بەڕێکەوتن)! ئێستا کە داهێنانە پزیشکییەکان بوونیان هەیە، دەتوانین بلّێین ئەو نەخۆشیانە بەشێوەیەکی زۆر باش بنەبڕ کراون.

بەلاّم ئەوەی جێگەی سەرنجو تێڕامانە لە داهێنانی یەکەم سەماعەی پزیشکیدا ئەوەیە بۆچی کچێکی ئەوروپی رێگەی نەدا پزیشکەکە دەست بدات لەسەر دلّی؟ بێگومان کلتووری ئەو کات تەنانەت لە ئەورووپاش بەو شێوەیە بووەو رێگە نەدراوە کەسێکی بێگانە دەست بدات لە شوێنە هەستیارەکانی، کە جگە لە تەنها کەسێك کەسانی دیکە مافی ئەوەیان نییە دەست لەو شوێنانە بدەن! لەوانەیە تۆی ئازیز ئەوە بە خەیالّتدا بێت کە ئەو رووداوە پێش نەوەدو سێ سالّ لەمەوبەر بووەو ئێستا دونیا دونیای پێشکەوتنەو سەردەمی تەکنەلۆژیایەو عەقلّەکان گۆڕانی زۆریان بەسەردا هاتووە، ئێمەش دەلّێین زۆر راستە زەمان هەزاران گۆڕانی بەسەردا هاتووە کە پێویست بە باسکردن ناکاتو هەمووان بە چاوی خۆمان ئەو راستییە دەبینین، بەلاّم دەبێت ئەوە بزانین کە هەندێك یاساو رێسا هەیە چەسپاوو نەگۆڕن، هەر لە سەرەتای ژیانی ئادەمیزادەوە تا دوا مرۆڤ کە دێتە نێو ژین، بۆ نموونە هیچ کام لە مرۆڤەکان لە هەر سەردەمێکدا بژین قبولّی ئەوە ناکەن هاوسەرەکانیان ناپاکییان بەرامبەر بکەن، نە ئافرەت لە پیاوی قبولّ دەکات، نە پیاویش لە ئافرەتی قبولّ دەکات! ئەمەش راستییەکە کەس ناتوانێ نکولّی لێ بکات، یاخود دەست لێدان و پشکنینی شوێنە هەستیارەکانی ئافرەت کارێکی نەخوازراوەو پەیوەندی بە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە نییە، ئەوەی سەرنجی راکێشام لە داهێنانی یەکەم سەماعەی پزیشکیدا ئەوەیە کە جێگەی داخە ئافرەتانی ولاّتی ئێمە بۆ هەندێك نەخۆشی زۆر تایبەت بە خۆیان دەچنە لای پزیشکێکی پیاو پشکنینیان بۆ ئەنجامبدات، لە کاتێکدا روویان نایات ئەو شوێنە هەستیارانە نیشانی ئافرەتانیش بدەن نەك پیاوان! لەگەلّ ئەوەشدا بە دەیان پزیشکی ئافرەتی ناودار هەیە کە پسپۆڕن لەو بوارەدا، خۆ ئەگەر لەو بوارەدا پزیشکی ئافرەتان نەبوایە رەنگە پاساوێکیان هەبوایە بۆ چوونیان بۆ لای پزیشکی پیاوان، یاخود ئەگەر نەخۆشییەکەیان نەخۆشییەکی ئاسایی بێتو وەکو خۆیان دەلّێن نەخۆشی ژنانە نەبێت، رەنگە کارێکی ئاسایی بێت، بەلاّم بۆ نەخۆشییە تایبەتەکانی ژنان پێویست ناکات خوشکان لە ژێر هیچ جۆرە پاساوێکدا عیادەی پزیشکە پیاوەکان قەرەبالّغ بکەن!

# بەڵێ و نا !!

شاعیری بڕیار ئازاد محی الدین محمد - خورماڵ

بەشێکی زۆری، ژیان پرسیارە
بەشێکی کەمی، وەڵام دیارە!
هەتا پرسیارێك، وەڵام وەر ئەگرێ
چەندین پرسیاری، بێ وەڵام ئەمرێ!
هەتا وەڵامێك، دروستو ڕاستە
چەندین وەڵامی، چەوتە ئاراستە!
ڕاستە بەڵێو نا، دوو کورتە وشەن
یەك لا کەرەوەی، بڕیار و کێشەن
لەگەڵ ئەوەشدا، گەورە و پڕ بەهان
بیرکردنەوەیان، دەوێ پڕ جیهان!
وەکو بەڵێ مان، زۆر و ئاسانە
وشەی نا کردن، لامان گرانە!
بەڵێ لەجێی نا، نا لەجێی بەڵێ
کێشی تەرازووی، تاوان وا دەڵێ!
وەك کێشەکانمان، چاوەڕێی چارەن
چارەی زۆر کێشە، هەڵەن، دوو بارەن!
ئەگەر بەڵێو نا، جێی خۆیان نەگرن
تەڕ و وشك هەموو، بەجارێ ئەمرن!
ئەگەر راستگۆیی، بمانکا بێ نان
پەتی سێدارە، هەڵبخەن بۆمان!
درێغی نەکەی، لە راست وتنا
تا داری درۆ، دەربێت لەبنا!

## وانەیەك بۆ ژیان

پێویست ناکات
هەموو ئەو شتانە بڵێیت کە دەیزانیت!
بەڵام پێویستە
هەموو ئەو شتانە بزانیت
کە دەتەوێت بیڵێیت!!

# چۆن بگەینە ئامانجەکانمان؟!



ن/ محمود الحسنی

و/ هەڵمەت فوئاد

کۆمەڵگای مرۆڤایەتی نموونەگەلێکی زۆر لەو جۆرە کەسانە لە خۆی دەگرێت کە لە جیهانی خەونەکانیاندا مەلە دەکەنو هەمیشە لە کەناری خەیاڵدا لەنگەریان گرتووەو لە پردانە واقیعو بە کرداری کردنی ئەو ئایدیایانەی کە سەری قاڵ کردون سڵ دەکەنەوەو دەشخوازن شنەی با بە ئاراستەی رێرەوی کەشتیەکانیانەوە هەڵبکات، بۆیە ماوەیەکی زۆر لە ناو بازنەی ئەم خەیاڵکردنە دەمێننەوەو چاوەڕوانی ئەو چرکە پڕ لە کامەرانییە دەکەن کە ساتەوەختی گەیشتنە بە ئامانج بە شێوەیەك هەموو ئەو هەوڵو تەقەلاو شەونخونییانەی لێ قرتێندراوە کە بەهای گەیشتنە ئامانجە.

ئێمە زۆر کات وابەستەی بەرهەمی کۆششکردن دەبین بێ ئەوەی بیر لەو هەنگاوانە بکەینەوە کە بەهۆیانەوە دەگەینە مەرامو داخوازییە کانمان، هەروەها پێش گەیشتن بە دەستکەوتی هەوڵ و ماندووبونەکانمان بیر لەوە ناکەینەوە کە دەبێت بە چاکی خۆمانی بۆ ئامادەبکەین، ئا ئەم ناوچەیە ناوچەیەکی ئارامەو هەڵبەتە فریو دەریشەو بەجۆرێك زۆرینەی خەڵکی لە خۆی دەگرێت، رەنگە بخوازین ببینە بەڕێوەبەرو خاوەن پرۆژەو دەوڵەمەند ببین، بەڵام ئایا بیرمان لە تایبەتمەندییەکانی بەڕێوەبەری سەرکەوتوو هەروەها بیرمان لەوە کردۆتەوە کە چۆن بتوانین شارەزای ئەوتایبەتمەندییانە بینو بایەخیان پێ بدەین؟ ئایا فێری ئەوە بووین کە چۆن بتوانین پرۆژەکان بەڕێوەببەین بە شێوەیەکی چاك؟ چۆن پارەکانمان بەگەڕ بخەین دوای ئەوەی بوینە خاوەنی پارەو پرۆژە؟ یان تەنانەت دوای ئەوە فێر دەبین کە بوینە خاوەنیان؟! لێرەدا زۆر بۆچوون هەیە دەتوانین سوودیان لێ وەربگرینو بە هۆیانەوە خۆمان ئامادەبکەین بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانمان بۆ نموونە: هەر کەسێك خەون بەوەوە دەبینێت کە ببێتە سەرۆکێکی سەرکەوتوو پێویستە بایەخ بەو زانیاریانە بدات کە لە بارەی لێهاتوویی فەرمانڕەوایی کردنی ئەوانی تر دەدوێت، یان پەیوەندی بکات بە خولی پەروەردەییو راهێنانی تایبەت، بێگومان ئەوکەسەی خولیای سەرکردایەتی کردنە دەبێت لە ناو واقیعی سەرکردەکاندا بژیتو فێری بڕیاردان بێتو خۆی تەرخان بکات بۆ ئەو وردەکارییانەی تایبەتن بەم بوارە بۆ ئەوەی هەرکات بوارێکی بۆ رەخساو گەیشتە ناوەندێکی بڕیاردان بزانێت چۆن مامەڵە دەکات. دەتوانین ئەگەر بمانەوێت بەردەوام لەگەڵ ئامانجەکانماندا بژین ئەمەش بەوە دەبێت کە بیکەینە باسی گفتوگۆکانمان لەگەڵ کەسانی تر بۆ نموونە کە سێك دەیەوێت وتاربێژێکی کاریگەرو لێهاتوو بێت لە کاتی وتاربێژیدا، با بەردەوام لەم بارەوە گفتوگۆ بکات دەربارەی باشترین شێوازی وتاربێژیو بزانێت چۆن کەسێك دەتوانێ سەرنجی گوێگرەکانی بۆ خۆی رابکێشێت، هەروەها با لێکۆڵینەوە بکات لەسەر هەندێك لە وتاربێژە سەرکەوتووەکانو قسەکەرە بە ناوبانگەکانی جیهان تاوەکو هۆی ئەو تایبەتمەندییەیان بزانێتو بۆ برەودان بە توانای خۆی سوودیان لێ وەربگرێت، ئەوە هەڵەیە هەر راوەستین چاوەڕێی بوارێك بکەین بۆ خستنەڕووی تواناکانمان، بەڵکو پێویستە خۆمان بوار بۆ خۆمان دروست بکەینو رەنج بدەین. زۆر شێواز هەیە بۆ بە پیشەیی کردنی ئەو بوارەی کاری تێدا دەکەین تاوەکو ببینە پسپۆڕو کە سێکی پرۆفیشناڵ تیایداو بەردەوام خۆمان بەرەو پێش ببەینو تواناو زانیارییەکانمان گەورەتر بکەین، بۆ نموونە: کە سێك خولیای بەرنامە رێژیو پلان دانانی هەیە دەبێت خۆی زۆر لەسەر ئەم بوارەدا رابهێنێت زۆر بنووسێتو لە گۆڤارو کۆڕە ئەلیکترۆنییەکاندا بڵاویان بکاتەوەو تیایدا قوڵ بێتەوە لە رەهەندو بنەماکانیو بەردەوام لە دوای باشترین سەرچاوە بگەڕێت کە باس لە پلاندانانو بواری بەرنامە رێژی دەکەن تاوەکو ببێتە راوێژکارێکی سەرکەوتووی جیاواز، شتێکی نوێ پێشکەش بکات نەك هی ئەوانی تر دووبارە بکاتەوە. لێرەدا دەبێت بڵێین: هەر ئەوەندە گرنگ نییە کە خەون ببینینو هیوامان هەبێت بەڵکو گرنگ ئەوەیە دەست پێشخەری بکەینو بچینە مەیدانی کار بۆ دروستکردنی کەسایەتیو بیروبۆچوونەکانمان بە هۆی بەکار هێنانی ئەو هەموو ئامرازو هۆکارانەی کە گشت بوارەجیاوازەکانی دەوڵەمەند کردووە بەسەرچاوەی جۆراوجۆرو بەهێز، گرنگە شتێك بکەین لە پێناوی دەستەبەرکردنی ئامانجەکانمان، ئیتر با واز لە زۆر وتن بێنینو رووبکەینە کەمێك کردەوە.

ن: هەڵوێست قاسم



# ئارەزوومەندانە هەنگاو بنێ؟

له منداڵێکیان پرسی ئایا کتێبت خۆش دەوێت؟ منداڵەکه له وەڵامدا گریاو بانگی دایکی کردو پێی گوت: دایه گیان تۆ کتێبت خۆش دەوێت؟ دایکی کەمێك وەستاو دوای تێڕامانو بیرکردنەوه، وەڵامی کوڕەکەی دایەوە: بەڵێ کوڕه ئازیزەکەی خۆم من زۆر کتێبم خۆش دەوێتو بەردەوام کتێب دەخوێنمەوە، لەبەرئەوەی زانیاری دەبەخشێتو مێشك فراوانو ژیان بەختەوەر دەکاتو مرۆڤیش ژیرو ژیرتر دەکات، منداڵەکەش له ئەنجامی ئەو پرسیارەی ئاڕاستەی کرابوو، وەڵامی دایکی هەڵبژارد، لەو رۆژه بەدواوه ئەو منداڵه تەمەن ١٠ ساڵەیه بەردەوام داوای له دایکی دەکرد کتێبی بۆ بکڕێت، بۆ ئەوەی زانیاری به دەستبێنێتو مێشکی فراوان بکاتو ژیربێتو بتوانێت رووبەڕووی نەزانین بووەستێت، دوای ئەوەی ئەو منداڵه تەمەنی بوو به ٢٠ ساڵان، دایکی کۆچی دوایی کردو بۆ دواجار ماڵئاوایی کرد له منداڵه تاقانەکەی، منداڵەکەی جارانو تازه لاوەکەی ئێستا زۆر خەمبار بوو به کۆچی دایکیو نیشانەی دڵتەنگی به سیمایەوه دیار بوو، بەوەی شتێك له ژیانی کەمی کردووه، دوای چەند ساڵێك بەسەر کۆچی دوایی دایکی ئەو کوڕەدا، رۆژێك کوڕەکه پرسیارێکی ئاراسته کراو لێیان پرسی پاره باشتره یان زانست؟ کوڕەکه رەنگی گۆڕا ئەو رۆژەی به بیرهاتەوه که پرسی به دایکی کردبوو بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری (کتێبت خۆش دەوێت؟)، لەوەوه توشی شۆك هاتو نەیتوانی وەڵام بداتەوە، زۆر خەمبار بوو به هۆی دەستنەکەوتنی ئەو وەڵامه، ئەوەش لەوەوه سەرچاوەی گرت که نەیدەزانی به بیری خۆی بڕیار بداتو وەڵامی دروست بداتەوە، بەڵکو دەیویست وەکو جاری پێشوو به هۆی دایکییەوه وەڵامی ئەو پرسیارەی دەست بکەوێت.

لێرەوه بۆمان دەردەکەوێت:

* پێویسته منداڵەکانمان رابێنین لەسەر چۆنییەتی بیرکردنەوه، نەك به بیری خۆمان بیریان پێشکەش بکەین.
* فێریان بکەین پشت به خۆیان ببەستنو ئارەزوومەندانه بیربکەنەوە.
* پەروەردەیان بکەین لەسەر ئەوەی هیچ شتێك مەحاڵ نییه، بەڵکو مەحاڵ مەحاڵه.
* فێری راویان بکەین، نەك به دەستی خۆمان ماسییان بۆ بگرین.
* هەرچەنده منداڵ بچووك بێت، زانیاری زووتر وەردەگرێتو بەکاری دەهێنێت!

# بڕیار لە دیدی خوێنەرانیدا



ئا: محەمەد مێرگەیی

## چاوپێکەوتنێك لەگەڵ خاتوو (خەرامان حەمەد فەتاح)
## بەڕێوەبەری کارگێڕی لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

خاتوو (خەرامان)، یەکێکە لە خوێنەرە بەردەوامەکانی گۆڤاری (بڕیار)، سەبارەت بە بیروبۆچوونی بەڕێزیان لە بارەی گۆڤاری بڕیارەوە بە گشتی و سوودی بابەتەکانی کارگێڕی بە تایبەت بۆ توێژی فەرمانبەران، لە خستنەڕووی چەند پرسیارێکدا بەم شێوەیە هاتە گۆ:

**بڕیار: سەرەتا ڕاتان چییە دەربارەی گۆشەو بابەتەکانی گۆڤاری بڕیار بە گشتی؟**

خاتوو خەرامان: وەك مامۆستا حەسیب قەرەداغی بۆ کەژاڵی کچی دەڵێت:

**ئاوێنە ناتوانێ وێنەی دڵی من
جوانی تۆ دەرخا
نییە وەك شاعیر گەوهەر لە
دونیای جوانیا سەرخا**

بۆیە منیش دەڵێم: بۆ پێناسەکردنی گۆڤاری (بڕیار) تەنیا وەك بەڕێز (عادل شێخانی) سەرنووسەر لە ژمارە (١)ی گۆڤاری (بڕیار)دا دەڵێت: **(بانگەوازێکە بۆ ئەوەی مرۆڤەکان خۆیان بناسنو لە تواناو وزە بێ سنوورەکانی خۆیان سوود وەربگرن)**، ئەو خوێنەرەی دەیەوێت بیبیلۆگرافیایەکی ئەم گۆڤارە بخوێنێتەوە، با لە ژمارە (١٣)دا بابەتەکەی مامۆستای بەڕێز (عەبدولدائیم هەورامانی) بخوێنێتەوە، تاکو تێبگات ئەم گۆڤارە چ سوودێکی بە خەڵکی کوردستان گەیاندووە؟ تاکە گۆڤارە کە دوورە لە بازاڕسازیی کردن بە وێنە.

**بڕیار: زیاتر کام گۆشەو بابەتی گۆڤاری بڕیار دەخوێنیتەوەو تا چەند سوودی هەبووە بۆتان؟**

خاتوو خەرامان: من بەشێوەیەکی گشتی هەموو بابەتەکانی گۆڤارەکە دەخوێنمەوە، کە یەکەم ژمارەم چاوپێکەوت هەوڵمدا هەموو ژمارەکانم دەستکەوێت، بۆیە کە گەیشتمە ژمارە (٣) لەگەڵ خۆم هێنام بۆ فەرمانگەکەم بۆ بەردەستی بەڕێز (ئاسۆ حەسەن) بەڕێوەبەری گشتیو داوام لێکرد کە وەك گۆڤارو ڕۆژنامەکانی تر بەشداری مانگانەمان هەبێت بۆ ئەرشیفی کارگێڕی بە مەبەستی سوود وەرگرتنی فەرمانبەرانمان، بە سوپاسەوە داواکەمی قەبووڵکردوو ئێستا لە بەڕێوەبەرایەتییەکەمان زۆربەی ژمارەکانمان هەیە، فەرمانبەرانمان دەیخوێننەوەو دواتر بۆ لای ئێمەی دەهێننەوە، زۆرجار ئەو فەرمانبەرانەی کە بۆ دامەزراندن دێنە ژوورەکەم دەیخەمە بەردەستیان تاکو مامەڵەکەیان تەواودەبێت دەیخوێننەوە، هەروەها سودێکی زۆرم لێوەرگرتووە لە ژیانی ڕۆژانەمدا (کارگێڕیو خێزانی)، هەر کاتێك بەربەستێك بێتە سەر ڕێگەم وەك (مەرجەعێك) بەناو ژمارەکانیدا دەگەڕێم تا چارەسەرێك یاخود دڵنیاییەك دەدۆزمەوە.

**بڕیار: بەڕێزتان وەك بەڕێوەبەری کارگێڕی لە فەرمانگەکەتاندا، پێتانوایە تا چ ئاستێك بابەتەکانی بواری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی گۆڤاری بڕیار سوودیان هەیە بۆ فەرمانبەران بە گشتی؟**

خاتوو خەرامان: من لە ماوەی (٢٢) ساڵی خزمەتم یەکەمجارە گۆڤارێکی وا بەدی بکەم، کە ڕێنماییو ڕێنیشاندەر بێت بۆ ئەوەی فەرمانبەر بتوانێت هێڵێکی (سکە)ی ڕاست بگرێتەبەر بۆ ئەوەی دووربێت لە هەڵچوونو ماندووبوون، چونکە ئارامییەك دەبەخشێت بە مێشكو دڵ کە هەموو کێشەکانی ژیانمان لا ئاسایی دەبێت.

**بڕیار: ڕەخنەو پێشنیارتان چییە بۆ سەرجەم گۆشەکانی گۆڤاری بڕیار؟**

خاتوو خەرامان: من تەنها ڕەخنەم لە خۆم هەیە کە سەرەڕای هەموو خۆشەویستیو ڕێزم بۆ کارمەندانی ئەم گۆڤارە، لەبەر سەرقاڵیم بە ژیانی کارگێڕیو خێزانی، تەنانەت نەمتوانیوە لە ژمارەیەکدا بە دێڕێکیش هاوکارییان بکەم، تەنیا پێشنیاریشم بۆ ئەم گۆڤارە بەڕێزە ئەوەیە کە ئێمەی کورد دڵفراوانینو بەخیلی بە زانستەکەمانەوە ناکەین، ئەگەر بتوانرێت تەنانەت (٢) لاپەڕەش بێت بۆ زمانی (عەرەبی) تەرخان بکرێت، چونکە من دڵنیام کە فەرمانبەری وامان هەیە وەکو ئێمە پێویستی بە پەندو ئامۆژگارییەکانی ئێوەی بەڕێز هەیە، بەڵام نازانێت کوردی بخوێنێتەوە. لە کۆتاییدا هیوای سەرکەوتنو بەردەوامیتان بۆ دەخوازم.

# یاسای چاندنو دەستکەوت

ئا/ دانا فوئاد حمه صالح

ئەو وانەیەی کەلێرەدا فێردەبین ئەوەیە «بـۆ ئـەوەی بەرهەمێکمان دەسـتبکەوێت، دەبێت سـەرەتا شـەتلێك بچێنین»· سەرەتا چاڵ هەڵدەکەنینو شەتڵەکە ئاو دەدەین بەم کـرداره دەوترێـت (هەوڵ)، دواتـر ماوەیەك چـاوەڕێ دەکەیـن بەم کـردارەش دەوترێت (ئارامگرتـن)، تـا ئـەو کاتـەی دەتوانیـن بەرهـەم بەدەسـتبهێنین کەپێـی دەوترێت (دەستکەوت)·

بـە واتایەکـی دیکـە: دەسـتکەوت = ئارامگرتن + هەوڵ·

بـەڵام لە ژیانـی ئێمەدا بـە زۆری ئەم نەریتـە ون بـووە، ئێمـە دەڵێیـن: «ئەگەر ئەمڕۆ نەمامێك بچێنین سبەی چی بە دەست دەهێنیـن؟» وەڵامەکەی ئەمەیـە: (نەمامێکی بێبـەر)، یاسـای چاندنو دەسـتکەوت دەڵێت: (ئەمـڕۆ بیچێنـە، ماوەیـەك چـاوەڕێ بکە، ئەوکاتە بەرهەم بەدەست دەهێنیت)! لەوانەیە ئەگەر وەکو سـەردەمە کۆنەکان ناچار بوینایە بەرهەمهێنەری خواردنەکانی خۆمان بین لەم بابەتە زیاتر تێدەگەیشتین، بەڵام لە سەردەمی خواردنە سەفەرییەکاندا ژیان دەگوزرێنین·

کەسێك هەبوو دەیگوت: « ئەگەر کارێکی باشـم دەستکەوتایە ئەو کات بە ڕاستی چاك کارم دەکـرد، بەڵام ئێسـتا کاری مـن تەنها قاپ شـۆردنە، کەوایە هەرگیـز خۆم هیلاك ناکەم·» ئەم کەسـە بە هەڵـە بیردەکاتەوە! ئەگەر باشترین قاپ شۆری شار بیت ئەو کات خاوەن کارەکەت بایەخێکی زیاترت پێدەدات، یان کارێکی باشـترت دەداتـێ، یان لانی کەم هەست بە ئاسودەیی دەکەیت کە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو ئیشـەی کە خۆت حەزت لێیە بە دەستی بهێنیت·

یاسا ئەمەیە: (سـەرەتا دەبێت بیچێنیت دوایـی دروێنەی بکەی»، ئێـوە ناتوانن ئەم ئەسڵە تێك بدەن·

بۆ بە دەستهێنانی چەند هاوڕێیەکی چاك دەبێت کەسـانێکی زۆر تاقـی بکەینەوە، بۆ پەیداکردنی کارمەندێکی چالاك دەبێت لەگەڵ چەندین کارمەندی تردا چاوپێکەوتن بکەین، بـۆ پەیداکردنی چەند کڕیارێکـی بەردەوام دەبێت لەگەڵ سـەدان کڕیار ئەمدیووئەودیو بکەین، بـۆ دۆزینـەوەی خواردنێکی بە تام دەبێت چەندین ریستورانت تاقی بکەینەوە!



وەڵامێکی

ئارام حاتم/کۆلێژی ئەندازیار

···کەسـێك دەچێتـە شـوێنێکی دوور بـۆ خوێنـدنو ماوەیەکـی زۆر لەو شـوێنە دەمێنێتـەوە، دوای گەڕانـەوەی بۆنـاو خێزانەکەی داوایان لێکرد کە مامۆسـتایەکی ئایینـی بۆبێنن بۆ ئەوەی وەڵامی ئەو سـێ پرسـیارەی بداتەوە کە لە مێشـکیدا گەڵاڵە بووە·· مامۆستایەکیان بۆ دۆزییەوەو هێنایان تـا وەڵامـی پرسـیارەکانی بداتـەوە··· ئەم گفتوگۆیە لەنێوانیاندا روویدا:

قوتابییەکـە: تۆکێیـت؟ ئایـا دەتوانیت وەڵامی هەرسێ پرسیارەکەی من بدەیتەوە؟

مامۆستاکە: من بەندەیەکم لە بەندەکانی خودا، بە پشتیوانی خودا وەڵامی پرسیارەکانت دەدەمەوە·

قوتابییەکە: تۆ دڵنیای کە دەتوانی وەڵامم بدەیتـەوە؟! چونکە من ئەو پرسـیارانەم لە زۆر لە زاناو شارەزایان کردووە نەیان توانیوە وەڵامم بدەنەوە·

مامۆستاکە: هەموو هەوڵی خۆم دەدەم تا وەڵامت بدەمەوە بە پشتیوانی خوا·

قوتابییەکە: سێ پرسیارم هەیە:

١- ئایـا خوا هەیە؟ ئەگـەر هەیە کوانێ نیشانم بدە؟

٢- قەزاوقەدەر چییە؟

٣- ئەگەر شەیتان لە ئاگر دروست کرابێ، ئەوا ئاگر کاری تێناکاتو ئازاری ناگات، کەواتە بۆچی رۆژی دوایی دەخرێتە ناو ئاگرەوە کە هیچ کار ناکاتە سەری··؟

مامۆسـتاکە: زللەیەکی زۆر بە هێزی لە قوتابیەکە دا·

قوتابییەکـە: بـە ئـازارەوە پێـی گوت: بۆچی ئەو زللەیـەت لێدام؟ بۆچی لێم تورە بوویت؟··

مامۆستاکە زۆر بە هێمنی وەڵامی دایەوە: نـا من تـورە نەبـووم·· بەڵکو ئـەم زللەیە

## موستەحەق

وەڵامی هەر سێ پرسیارەکەت بوون!!

قوتابییەکە: بەڵام من هیچ تێنەگەیشتم!

مامۆستاکە: هەستت بە چی کرد کە ئەو زللەیەم لێ دایت؟

قوتابییەکە: بێگومان بە ئازار.

مامۆستاکە: (ئایا پێت وایە ئازار بوونی هەبێ)؟

قوتابییەکە: بەڵێ.

مامۆستاکە: کوا شێوەکەیم پێ نیشان بدە؟

قوتابییەکە: ناتوانم!

مامۆستاکە: ئەوە وەڵامی پرسیاری یەکەمت بوو، هەمووومان هەست بە بوونی خودا دەکەین، بەڵام ناتوانین ببینین...

پاشان پێی گوت: ئایا دوێنێ تۆ دەتزانی کە ئەمڕۆ من ئەو زللەیەت لێدەدەم؟

قوتابییەکە: نا.

مامۆستاکە: ئایا بەخەیاڵیشتدا دەهات کە ئەو زللەیەت لێ بدەم؟

قوتابییەکە: نا.

مامۆستاکە: ئەوەش قەزاو قەدەرە.

پاشان گوتی: ئەو دەستەم... کە زللەم پێ لێ دایت...لە چی دروست کراوە؟

قوتابییەکە: لە قوڕ.

مامۆستاکە: ئەی دەموچاوی تۆ لە چی دروست کراوە؟

قوتابییەکە: ئەویش لە قوڕ.

مامۆستاکە: هەستت بەچی کرد کە ئەو زللەیەم لێت دا؟

قوتابییەکە: وەك وتم بە ئازار.

مامۆستاکە: زۆر ڕاستە... هەرچەندە شەیتان لە ئاگر دروست کراوە... بەڵام ئاگر دەبێتەوە بە شوێنێکی بە ئازار بۆ ئەو.

سەرچاوە/ ئینتەرنێت.




# 13 خاڵ بۆ ئەوەی بە شادی بژین

و: هێرۆ موحەممەد ئەڵماس

لەم بابەتەدا چەند شێوازو پێشنیارێکی سادە دەخەینە پێش چاوت، بۆئەوەی بە شادی بژیتو ژیانێکی شادو خۆشت هەبێت، بەڵام ئەم چەند خاڵە لەگەڵ سادەییەکەیاندا زۆر گرنگو مانادارنو ڕۆڵێکی کاریگەریان دەبێت لە ژیانتدا، بۆیە تۆش هەرچی زووترە هەوڵ بدە کە جێبەجێیان بکەیت:

١- هەنووکەو لە ئێستادا، بە وانەو پەند وەرگرتن لە ڕابردوو، هەروەها بە ئومێدو هیوا بە ئایندەو داهاتوویەکی باشترو جوانترەوە بژی.

٢- لەگەڵ ناسازگارییەکانی ڕابردوودا ئاشت ببەرەوە، بۆ ئەوەی ئێستاو زەمانی حاڵتان خۆشو شاد بێت.

٣- ژیانی خۆت بەراورد مەکە بە ژیانی کەسانی دیکە، چونکە تۆ لە ڕاستیو حەقیقەتەکانی ژیانی ئەوان ئاگادار نیت.

٤- ماڵەکەت بە گوڵ برازێنەرەوە، مۆم داگیرسێنە، لێفەو بەتانیو سەرچەفی جوان بەکار بهێنە، جلو بەرگو پۆشاکی فراوانو کراوەو پانوپۆڕو جوان لەبەر بکە، هەرگیز شتێك تایبەت مەکە بە کاتێکی دیاریکراوەوە، چونکە لەوانەیە سبەینێیەك لە ئارادا نەبێت.

٥- هیچ کەسێك بەرپرسیاری شادیو خۆشییەکانت نییە، هەروەها هیچ کەسێك بەرپرسیاری نەهێشتنو لابردنی تەنهایی تۆ نییە، جگە لە خودی خۆت.

٦- لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ گرفتو کۆسپو موصیبەتەکاندا، بەم پرسیارە لێیان بکۆڵەرەوەو لێیان ورد بەرەوە کە: ئایا پاش چەند ساتێکی دیکە ئەم کێشەو موصیبەتانە هەر هێندەی ئێستە گرنگ دەبن؟

٧- باشترین ئارامبەخشو ئازارشکێن: تێپەڕبوونی کاتو زەمەنە، کات هەموو شتێك چارەسەر دەکات.

٨- هەر کەسێك کە تووشی هەڵەو خلیسکانو پێ هەڵکەوتنێك دەبێت، نرخو ڕێزی تایبەت بە خۆی پێ ببەخشە، هەروەها هەموو شتێك کە هەیەو وجودی هەیە، نرخو بەهای تایبەتی خۆی بۆ دابنێ.

٩- هەموو پێگەو پلەو پایەیەك، باش بێت یان خراپ، تێپەڕدەبێتو دەگوزەرێت.

١٠- لەگەڵ دۆستو هاوڕێ چاکەکانتدا لە پەیوەندیدابەو، ڕێز لەم گەنجینە گرانبەهایە بگرەو نرخی بۆ دابنێ، ئەوەش بزانە کە کتێب باشترین دۆستو هاوڕێیە، هەموو دۆستو هاوڕێیەکیش وەك کتێبێکی بە نرخ وایە، هەرچەند لێی ورد بیتەوەو قوڵ بیتەوە، شتی زیاتری لێ فێر دەبیت.

١١- خۆت لە کۆتو بەندی شتە بێ سودو بێ نرخو پتورکاوو ڕزیوەکان دەرباز بکە.

١٢- سود لە هەموو کەشو شوێنەکانی ماڵەوە وەربگرە، هیچ بەشێکی ماڵەوە تایبەتو تەرخان مەکە تەنها بۆ میوانو خۆت سودی لێ وەرنەگریت، چونکە خۆت ئازیزترینو بەڕێزترین میوانی ماڵەکەی خۆتی.

١٣- حەسرەتو خەمو خەفەت بۆ شتە لەکیس چووەکان مەخۆ، چونکە ئەم کارە دەبێتە هۆی بە هەدەردانی کاتت، تۆ ئەو شتەی کە پێویستە لەبەردەستتدایەو هەتە، هێشتاش باشترین شتەکان لە ڕێگەدانو ماون کە پێیان بگەیت.

سەرچاوە:

گۆڤاری: شادکامی. ژمارە (٦٦).



# چۆن بگەین بە ئاسودەیی‌و بەختەوەری؟

ن/مودریک عەلی عارف

دڵو دەروونی ئارام‌و ڕۆح‌و گیانی ئاسودە باشترین‌و گرنگترین دەسکەوتی گرانبەهای ژیانی مرۆڤە، هەموو هەوڵو تێکۆشان‌و لێبڕان‌و ڕەنجی مرۆڤیش لە ژیانی ئەم دونیایەدا بۆ دەستخستنی ئەم گەوهەرە نایاب‌و دەگمەن‌و بەنرخەیە.

پەیجۆیی‌و عەودالی‌و گەڕانی مرۆڤ بۆ دەستخستنی ئەم گەوهەرە نایاب‌و دانسقەو گرانبەهایە، تا ئاستێکە کە هەندێجار مرۆڤ لە پێناوی دەستخستنیدا هەموو ژیانی دەکاتە قوربانی‌و بەخت دەکات، بۆ ئەوەی کە چەند ڕۆژێك یان چەند کاژێرو خولەکێك زیاتر بە ئارامی‌و ئاسودەیی بژی، وەك ئەوەی کەسێك هەموو ژیان‌و تەمەنی لە پێناو دەستخستنی پارەو سەروەت‌و ساماندا بەخت دەکات بۆ ئەوەی ئاسودە بێت، بەڵام کاتێك کە دەگات بەو پارەو سەروەت‌و سامانە، دەبینێ ئاسودەیی‌و بەختەوەری مەرج نییە لە هەبوونی سەروەت‌و سامانی زۆردا بێت، بۆیە ئەمجارە ئامادەیە هەموو پارەو ماڵو سامانەکەی لە پێناوی ڕۆژێك تەمەنی زیاترو کاژێرێك ئاسودەیی‌و ئارامی دڵو دەروونیدا خەرج بکات‌و ببەخشێ.

بۆ گەیشتن بە ئارامی‌و ئاسودەیی‌و دەستخستنی ئەو سەرمایەو گەوهەرە گرانبەهایە، بۆ پەیداکردنی خۆراکی مەعنەوی ڕۆح‌و بۆ چەشتنی چێژی ژیان، لەم کورتە بابەتەو لەم چەند دێڕەی خوارەوەدا چەند پێشنیارێك دەخەینە ڕوو بە هیوای سود لێ وەرگرتن‌و جێبەجێ کردنیان:

١- دوور بکەوەرەوە لە هەر کەس‌و شتێك کە دژو پێچەوانەیە لەگەڵ دڵ ئارامی‌و ئاسودەیی ڕۆح‌و لە ناوبەری شادی‌و بەختەوەری‌و خۆشحاڵییە، وەك خەمۆکی‌و دڵەڕاوکێ‌و ڕق‌و کینەو ئیرەیی بردن‌و... هتد.

٢- دوور بکەوەرەوە لە بیرکردنەوەو قسەکردن لەبارەی ئەو شتانەوە کە خراپ‌و ناشیرین‌و نێگەتیڤن‌و هیچ خزمەتێکی ئەوتۆ بە پێشکەوتن‌و ژیانت ناکەن.

٣- هەوڵ بدە کە دڵت کەیل‌و لێوان لێو بکەیت لە عیشق‌و خۆشەویستی‌و، ئەو خۆشەویستییەشت ببەخشە بە هەموو سروشت‌و مرۆڤ‌و دروستکراوەکان، هەروەها هەوڵ بدە کە با ترۆپکی خۆشەویستییەکەشت بۆ خواو پێغەمبەرو -د.خ- و پەیامەکەی بێت.

٤- هەرگیزو هیچ کاتێك بەتاڵ‌و بێ ئیش‌وکار مەبە، چونکە سەخترین‌و دژوارترین ئیش‌وکار: بێکاری‌و بەتاڵییە، کەسی بە تاڵ‌و بێکار تووشی چەندین کاری خراپ‌و ناشیرین‌و ناباش‌و نەگونجاو دەبێت.

٥- جوانی‌و چاکییەکانی خەڵکی ببینە‌و فەرامۆش‌و لەبیریان مەکە، ئەوەش بزانە هیچ کەسێك نییە کە بەلایەنی کەمەوە جوانی‌و چاکەیەکی نەبێت، تەنانەت خراپترین کەسەکانیش، لە جوانی‌و چاکەکانەوە تەماشای کەسەکانی دەوروبەرت بکە، نەك لە هەڵەو خراپی‌و ناشیرینییەکانیانەوە.

٦- هەر پیشەو کارێکت هەیە هەوڵ بدە بە باشترین‌و جوانترین شێوە ئەنجامی بدەیت، بە بێ تاقەتی‌و بێزارانە هیچ کارێك ئەنجام مەدە، چونکە ڕۆحی خۆت‌و دەوروبەرەکەشت ئازار دەدەیت‌و، نە خۆت‌و نە ئەوانیش چێژ لە ئەنجامدانی ئەو کارەت وەرناگرن.

٧- پەیوەست مەبە بە خەڵکی‌و هیچ کەسێکەوە، ئەگەر نزیکترین کەسەکانی دەوروبەریشت بن، بۆ نموونە بڵێیت: مادام فلان هاوکارو هاوپیشەو هاوڕێم بە باشی‌و بە جوانی کارەکەی ئەنجام نادات، ئەوا منیش بەو شێوەیە دەکەم‌و ئەرك‌و کارەکەم بە باشی‌و بە جوانی‌و بە ڕێك‌وپێکی ئەنجام نادەم.

٨- خۆت سەروەرو خاوەنی بڕیاری خۆت بە، نەك کۆیلەی خەڵك‌و ڕووداوو هەست‌و سۆزە کاتییەکانت، هەوڵ بدە تۆ خەڵکی‌و ڕووداوەکان ئاراستە بکەیت، نەك ئەوان تۆ ئاراستە بکەن.

٩- پاش دەستگرتن بە هۆکارەکان‌و گرتنەبەری ڕێوشوێنە پێویستەکان، کاروباری ژیانت بە خوا بسپێرەو دڵنیابە کە ئەو باشترین پشتیوانتە، ئەڵبەت ئەمە بە مانای پاڵدانەوەو پشتوێن شلکردن نا، بەڵکو ئەوەندەی کە ئەرك لەسەر شانی تۆیە ئەنجامی بدەو ئەوی دیکەی بدەرە دەست خوا، واتە "توکل" بکە بەخوا نەك "تواکل"و متمانەی تەواوت بە خوا هەبێت کە شتێکت بۆ دەهێنێتە پێشەوە خێرو بەرژەوەندی تۆی تێدایە.

١٠- گەشبین بەو هیواو ئومێدت بە داهاتوویەکی باشترو جوانتر لە ئەمڕۆ هەبێت، ئەوەت لە پێش چاو بێت کە خودی خۆت دەتوانیت ئایندەیەکی باش‌و جوان بۆ خۆت دەستنیشان بکەیت‌و لە تابلۆی ژیانتدا وێنەو نیگارێکی ڕازاوەو قەشەنگ بنەخشێنیت.



# چۆن ئەزیزەکانی ئەو دیو سنوورمان بێنینەوە ناوچەی سپی؟

هەردی غازی

سەرەتا چەند دێڕێك دەدەینە ناونیشانی بابەتەکەمان، لە پەرژینی ئەم ناو نیشانەدا رادەهێنرێینو فێردەبین کە دەبێت هەریەك لە ئێمە خەمخۆر بیو هەوڵبدات ئەو کەسانەی لەو دیو سنورەوەن بێنەوە ناوچەی سپی، وشەی (بێنەوە) فەرمانمان پێدەکاتو دەڵێ: خێراکەن لە ناوچەی سپیدا خۆتان جێگیرکەن ئەوکات هەوڵ بدەن ئەوانەی ئەو دیو بگێڕنەوە، چونکە گەر خۆت جگەرە کێش بی، ناتوانی بە کەسانی تر بڵێی جگەرە مەکێشن.

دەمەوێ پێتان بڵێم: کە بە هەڵە تێمەگەن مەبەستمان هێڵی سنووری نێوان وڵاتان یا دراوسیو هاورێکانت نییە، بەڵکو هێڵە سورە سنورییەکانی ژیان دەڵێین.

نمونەیەك: لە زانستی مێروزانیدا، چەند جۆرێك شێوازی دەم (لە مێرووودا) دۆزراوەتەوە، جۆرێکیان بەشەکانی دەمی تەواون، ئەمەش تەنها بۆ ئەوەی بتوانێت لەسەر هەموو جۆرە خۆراکێك بژی، هەم ڕەق هەم شل.

نموونەیەکی دی: بیرێك لە خۆت بکەرەوە، چاوت هەیە کەواتە دەبێ پێی بڕوانی.. گوێت هەیە دەبێ گوێ بگریت.. دەمت هەیە دەبێت قسەی پێبکەیت، لوتت پێبەخشراوە، بێگومان بۆنی پێدەکەیت... هتد، تا نوکی پێتو قوڵایی جەستەت ئەمە لێك بدەوە.

گەر کەسێك بێتو بڵێ: نابێ ئەو مێرووە بەشەکانی دەمیو تۆش گوێت بەکار بهێنن بۆ جێبەجێکردنی کارەکانتان، ئایا ناکەوێتە بەر خەشمو قینی تۆو مێرووەکە؟ پێم وایە هەردووکتان پێکەوە دەڵێن: ئەی کاری پێنەکەین بۆ پێمان دراوە؟ قەیدی نییە دیسانەوە ئەگەر کەسێکی ژیر وتی: دەکرێت چەقۆ بۆ کارەکانی چێشت لێنان بەکاربهێنین، بەڵام ئایا بە بیانووی بوونی چەقۆوە دەتوانیت بە هاورێکەت بڵێیت ئەوە سەرت دەبڕم؟ چونکە چەقۆ هەیە جا ئەگەر کاری پێنەکەم بۆ پێم دراوە؟

تەواوکردنی ئەو بابەتە بۆ خۆتان رۆژانە زۆرشت دەبینینو دەبیستین لەوانە:

دایك: کچم من نامەوێ گوێ لە گۆرانی بگریت.

باوك: واز لەو برادەرەت بهێنە، ئەو زنجیرەی ملت لابەو قژت چاککە.

برای گەورە: خۆ پێم وتی جگەرە مەکێشە.

خوشکی گەورە: تۆ بۆ هێندە بێمێشکی ناهێڵم تەماشای فلیم بکەیت.

زیاتر لە هەزاران رستەی لەو جۆرە رۆژانە بەرامبەر تاکەکانی کۆمەڵگەکەمان دەکرێتەوە، بەڵام با سەیرێکی ئەو ڕستانە بکەین، فەرمانو هیچ بەدیلێکیان پێ نییە، بەڵکو وەك نموونەکەی پێشوو وەهایە، چونکە گەر کەسێ بڵێ جگەرە خراپەو مەیکێشە دەبێ بە دەستی راستی شتێکی پێبێ بتداتێ لە بری جگەرەکەدا دایبنێی جا بنێشتە یا خواردنێکی رۆحی!

زیاتر درێژە نادەینو دەڵێین: مادەم مرۆڤ مرۆڤە، کەواتە حەزی لە هەموو جۆرە شتێك هەیە، مرۆڤە چاکەکانیش گۆڕانکارییان دەوێت، بەڵام بەداخەوە نامانەوێ ئەو گۆڕانە دروست ببێت، کەواتە گەر دەتەوێت خراپەکان بگۆڕیت ئەوا دوو رێگەت لەبەر دەستدایە: یەك: کەسەکە واز لەو کارە بهێنێت.دووەم: یاخود لەسەر کارەکەی بمێنێتەوەو بە باشی بەکاری بهێنێت.

بۆ نموونە گەر ئامۆژگاری ئەکتەرێکی سینەماییت کرد کە فلیمی نادروستی (بە پێوەری من) هەیە، ئەوە بڵێ: هاوڕێم بەڕاستی بەهرەمەندی تۆ منی سەرسام کردووە، بەڵام زۆر حەزدەکەم لەمەودوا ئا لەم فیلمانەی تردا بەشدار بکەیت، هەم سەرکەوتو هەم کامەرانتر دەبی، (چونکە بەم کارە نوێیە هەم ئارەزووەکەت جێبەجێ دەکەیت، هەم خزمەتی کۆمەڵگە تینووەکەمان دەکەیت)، بەڵێ ئەم قسانە هەزار هێندەی ئەوە باشە هونەرەکەی لێبکەیتو دوایەکان دەست بکات بە گلۆبەرۆژە فرۆشتن، دەی ئەزیزم هەر ئێستە ئەم تەکنیکە جێبەجێ بکەو لە نزیکترین کەسەکانتەوە دەست پێبکە، بزانە بە خێرایی چ سەرکەوتن گەلێك دەبینی.. گەر بە لاتەوە قورسە جارێك تاقیکەرەوە، تا دڵنیابیت.



# پەیامی من!!

پەشێو مجید

ئەم پەیامە بۆ ئێستاتە
ڕێك بۆ ئەم ساتەی ژیانتە
بۆ ڕووخانی شاخی تووڕەبوون و ڕقتە
بۆ هەرەسی چیای کین و نالەباری دەروونتە
ئەم پەیامە بۆ شکستی جەردەکانی ناخی تۆیە
بۆ سەرگومی شەیتانی نێو ڕۆحی تۆیە
بەکۆڵێ عەشق و خۆشەویستییەوە
بەرەو پیلو بۆ یارمەتیدانی تۆ بەڕێوەیە
دەفەرموێ:
لە لوتکەی خۆشبەختییەوە هاتوم
لەگەڵ شـــەماڵ دەســتی گوڵەباغێکی عەشقم
گرتووە
بە کۆڵێ سەوزایـــــی و
بۆن و بەرامەی خۆشەویستی
لەگەڵ بولبولێکی دڵشـــاد
بەدەم چرینی گۆرانی بەختەوەری
بـــەرەو ئەم وەرزەی بەهاری نێو ناخی تۆ بە
ڕێکەوتوم.
هاتوم بڵێم:
وەرە با بە خۆشبینی لەم ڕێیەدا گوزەر بکەین
پلانی هەرچی خەمە وەبەر شکستی بخەیـن
لە نێو هەوراز و لێژی ئـەم سەفەرە
بوێـرانە ڕێ تەی بکەیـن
هێندە چاونەترس بین
لە ئاست هەرچی بەربەستێ هەیە
هەڵوێستەش نەکەین
بەرزونزمی
بەفرو بۆڵان
ساردیو گەرمی
سەرماو سۆڵە
گشتی لەپێناو عەشقێکی ئاوڕەنگ
وەلا بنێین
هەست بەبوونی تاکە ڕێگرێکیش نەکەین
هاتوم بڵێم:
وەرە با ئاشتەوایی لە نێوانمان بەرپا بکەین
ئاسایش و ئارامی لەم وڵاتی عەشقا
بەرقەرارکەین
مرۆڤانە هەڵسوکەوتکەین
دەست لە ناودەست
بەیەکەوە
بەرەو ئەم بەرزایی عەشقا
بە ڕێکەوین
هەر لەوێوە
دوو کۆتری ڕەنگ سپی
هەڵفڕێنین
ئەم وڵاتی نەهامەتی و ڕق و کینە
لە ڕەگەوە هەڵتەکێنین
وڵاتێکی ڕووناك بەخش
بنیات بنێین
یاسایەك بۆ خۆشەویستیو
یەکێ بۆ لێبوردەیی
دەستورێکی تر دابڕێژین
دڕکی نادادی بسوتێنین
گوڵی دادپەروەری بڕوێنین
پەیامما‌ن تەبایی بێو
لە بۆ سەحرای وشكو چۆڵ
ئاو و ئاوەدانی بین
وەرە بـــا لـــەم جیهـــادی ژیانـــەدا دلێرانـــە
بجەنگین
جوامێرو چاونەترس
ڕۆحێکی پڕ لە جوهدو تێکۆشان بین
سونبولێ بەرخودانو نەبەردی بین
وەرە با پەردەی ڕقمان هەڵدەینەوە
مۆمێك بۆ
لەدایکبوونی بەهاری شادی
دابگیرسێنین
ئاهەنگێکیش بۆ
مەرگی کینەو
ئاشتبونەوەمان سازکەین
شۆڕشی عەشق هەڵگیرسێنین
لەمەیدانا
وەکو شەمع و پەروانە بین
لە غەریبی بۆ یەکتری بسوتێینو
لە تەنگانە قوربانی یەکتری بین
لە دووری یەکتریشا
عاشقانە شیعر بۆ یەکتری بچڕین
لەم ژیانە تەواوکەری یەکتری بین
ئێمە هاتووین
ئاقڵانە سەرهەڵێنین
تەنهاو تەنها
حەق ببینین
ئینجا بەرەو مەنزڵگای چارەنوس
هەنگاو بنێین
لە شەوی بێبەیانی
وەکو مۆم بسوتێین
لە ڕۆژی بێ کۆتاش
هاوکار بین
بۆ هەتیوان باوكو
بۆ ستەم لێکراو حەقسێن بین
لە سەرمادا پەناگەو
لەگەرمایی فێنکی
بۆ شەوەزەنگی ئەم دونیایە
وەکو خۆر بین
ئێمە هاتووین بۆ ئاوەدانی ئەم ژیانە
نـــەك بە یەکتـــر نەویســتی زەوی بکەین بە
وێرانە
ئێمە هاتوین هاوڕاز و هاودەمی یەکبین
بە خەندەوە کۆتری سپی بفڕێنین
بە دەم ئاسمانە
گوڵ بەعەزابی سێدارە نەبەین
باڵی پەپولە نەشکێنین
دەریـــا نەشێوێنیـــن
دیمەن نەسوتێنین
بڵاوەی خۆشەویست کەین
بەبێ سنوور و پێوانە.

و/ ڕۆشنا هاشم

# ٢٥ ئامۆژگاریی بۆ سەركەوتن

١- لێوبەخەندە بە: ئاگاداربە پێكەنینت با ئاسایی بێتو ئەگەر نەتتوانی پێ بكەنی پێویستە دروستی بكەیت، بۆ ئەوەی ببێتە خویەك لە لات، چونكە پێكەنین نهێنی زۆری تێدایە، وات لێدەكات درەنگ پیر ببیتو دەمارەكانی لەشت بە هێز دەكاتو دڵت بە زیندوویی‌و چالاك دەهێڵێتەوە.

٢- كاتەكانت ڕێكبخە: بەرنامەكانت ڕێكبخە بەرامبەر بە كاتەكەت ویستو ئیرادەت هەبێت ئەگەر وانەكەیت ئەوا دەبێتە هۆی دزیكردن‌و گاڵتەجاڕی كردن بەكات، ڕێگەدان بە كەسانی تر كە ڕەفتار بەكاتەكانت بكەن بە ئارەزووی خۆیان چونكە ڕێكخستن كارێكی تاڵە بەڵام بەرهەمەكەی لە كۆتاییدا شیرین‌و سوود بەخشە.

وەسیەتی من بۆ تۆ ئەوەیە كە هەوڵ بدەیت ئەگەر سەد جاریش بێت چونكە واتای دۆڕان نییە دەبێتە هۆی بەدەست هێنانی لێهاتوویی.

٣- سنووری ژیانت دیاری بكە: بە خۆت بڵێ ئەمڕۆ بەئاسوودەیی دەژیم‌و گوێ ڕایەڵی خوای خۆم دەبم، ڕێزی گەورەكان دەگرم، بەزەیم بە بچووكەكاندا دێتەوە، بەخۆم دەڵێم ناهێڵم كەس ژیانم لێ تێك بدات بەو جۆرە دەژیم تا دەمرم.

٤- ئامانجەكانت بە ڕوونی دیاری بكە: ئەمەش لەكاتی نوسین‌و كاركردن لەسەر بەجێهێنانی ئامانجە كۆمەڵایەتی‌و ڕۆحی‌و لایەنە ئابووریەكانت بنووسە ئەوانەی دەتەوێ بەجێیان بهێنی تۆماریان بكە.

٥- خۆت بەكەم مەزانە: تۆ دروستكراوێكی گەورەی خودای‌و تواناو هێزی پێ بەخشیوی بەشێوەیەكی زۆر، تەنها خۆت خۆشەویست بكە بە قسە پاشانیش بە كاركردن.

٦- لە ژیاندا وەكو بەردێك وابە ئەوەی بەفر لەسەری دەشكێت، ئەگەر ئاوڕ لە پشتەوە بدەیتەوە ناتوانی یەك هەنگاو بەرەو پێشەوە بڕۆی.

٧- گوی بە تانەو تەشەری خەڵك مەدە، ئارام بگرە ئەگەر كەسێك ئیرەیی پێ بردیت، چونكە ئارام گرتنت وەكو چەكێك وایە بەرامبەر بەو كەسەی كە ئیرەیت پێ دەبات.

٨- مەبە پۆستەچی شەیتان: پڕوپاگەندەو دووبەرەكی لە نێوان خەڵك بڵاومەكەرەوە بەبێ بەلگە، ئەگەر وات كرد ئەوا دەكەویتە نێو گەورەترین گوناهەوە، ئەگەر قسەت لەناو دڵت دا بوو تۆ پاشای ئەوی بەڵام ئەگەر بڵاوبووەوە تۆ دەبیتە بەندەی ئەو.

٩- خەمی هەمو ژیان لە مێشكی خۆت هەڵمەگرە بەلكو لە لیمۆی ترش شەربەتێكی شیرین دروست بكە خەمەكان هەموو وەلادەنێی.

١٠- لەدەركردنی بڕیارەكانتدا چاو نەترس بە، دوو دڵ مەبە لە بەجێهێنانی، چونكە بڕیارەكانت چارەنووست دیاری دەكەن.

١١- دڵنیابە لە خودی خۆت، ئەگەر كارێكت كرد هەموو ئەركەكەی بخە سەرشانی خۆت.

١٢- ئەگەر تووشی هەر ناخۆشییەك بووی لە ژیانت ئەوا مەترسە بەلكو پێویستە ئارام بگری چونكە ئارام گرتن كلیلی خۆشیە. بزانە پاش هەموو ناخۆشی یەك خۆشی یەك هەیە، دووناخۆشی بەرامبەر یەك خۆشی نابێت.

١٣- دڵت لە كینەو ئیرەیی گومانی خراپ پاك بكەرەوە، وازبێنە لە ئازاردانی خەڵك.

١٤- مێشكت هەموو ڕۆژێك نزیكەی (٦٠٠) بیرۆكەی تازەت پێ دەبەخشێ، ئاگاداربە سوود لەم هێزە عەقڵیە وەربگرە چونكە هێزی مێشك وەكو ئاو وایە ئەگەر بەكارت هێنا ئەوا دەجولێت‌و چالاك دەبێت.

١٥- بەردەوام خەریكی وەرزش كردن بە: هەموو ڕۆژێك نیو كاتژمێر وەرزش بكە چونكە چالاكی بەدەست دەهێنی بەم جۆرە دەتوانی چەوری لەشت كەم كەیتەوە.

١٦- توڕە مەبە: چونكە تووڕە بوون دەبێتە تێكدانی كەیف‌و دەبێتە هۆی تێكدانی خۆشەویستی، ئەگە توڕە بوویت ئەوا بێ دەنگ بە.

١٧- هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەوانەی لەدوای كەم‌و كورتی خەڵك دەگەڕێن وەكو مێش وان تەنها لەسەر برین دەنیشن.

١٨- دەفتەرێكی بچووك لە گیرفانت هەلگرە بۆ ئەوەی كارەكانت‌و كاتەكانتی تێدا ڕێك بخەی.

١٩- هیچ بڕیارێك مەدە هەتا لەهەموو لایەكەوە سەیری دەكەیت پاشان لەگەل دەوروبەرت وتوێژی لەسەر بكە، ڕای كەسانی زیرەك وەربگرە ئەگەر سەركەوتوو بوویت ئەوا دەگەیتە شتەكە ئەگەر نا زەرەر ناكەیت؟

٢٠- وەكو مێرووڵە وابە چونكە مێرووڵە سەدجار سەردەكەوێتە سەردار، پاشانیش بەردەبێتەوە پاشان سەردەكەوێتەوە هەتا دەگاتە جێ مەبەستو بێزاریش نابێتو هیچیش ناخوات.

٢١- ئەگەر شتێكی ڕابردووت بەبیر هاتەوە ئەوا مێژوویەكی ڕووناك بەبیرخۆت بهێنەرەوە، ئەگەر ڕۆژێكت بەبیر هاتەوە ئەوا بیر لە دەستكەوتەكانت بكەوە، ئەگەر بەیانیت بەبیر هاتەوە ئەوا خەوی جوان بهێنەرە بیری خۆت.

٢٢- كاری باش‌و خزمەتی كەسانی تر بكە لە ژیاندا، تەنهاو لە پەراوێزدا مەبە، چونكە تەنیایی ناخۆشی یە هەمیشە لەگەڵ كۆمەلگەدا خۆت بگونجێنە چونكە كۆمەلگە دەیەوێت جێ پەنجەت بە ڕوونی ببینی لە ڕێگەی كارەكانت‌و دەستكەوتەكانت.

٢٣- دیاری جوان‌و بەبایەخ ببەخشە كەسانی دەوروبەرت بە وشەی باش‌و جوان بچۆرە نێو دڵی خەلكەوە.

٢٤- بەشێوەیەكی باش سەیری ژیان بكەو ڕەشبین مەبە ئاگاداری كۆڕی ڕەشبینان بە چونكە ئەوان ژیان تەنیا بە ڕەنگی ڕەش دەبینن.

٢٥- خەم لە ماڵی دونیا مەخۆ كارێكی وەها بكە كە دونیا لەناو دەستت دا بێ نەك لەناو دڵت نیشانەی ئەمەش ئەوەیە ئەگەر ماڵ و سامانت لەدەست چوو ئەوا خەمی بۆ مەخۆ ، وابزانە هیچ شتێك ڕووی نەداوە.

# نهێنی هەنگاوەکانی پێشکەوتنو کارامەیی؟

عادل شاساواری

ئەگەر لەپڕ غافلگیریان کردیتو چاویان بەستیت، سەریانخستیتە ناو ئۆتۆمبێلێکەوەو دووریان خستیتەوە، پاشان چاویان کردیتەوەو بینیت لە دارستانێکی جوانو قەشەنگدایت، کە دڵێکو سەد دڵ حەیرانی دەبێ، نەخشەیەکیان پێدایت، ئایا دەتوانی بگەڕێیتەوە شوێنی خۆت؟!

* نەخێر، چونکە من هیچ سەرو سەودایەکم لەگەڵ نەخشەدا نییە، لێی نازانم.

* بەڵێ، بەپێی نەخشەکە دەتوانم بگەڕێمەوە.

* ئەگەر ئەوێ خۆشتر بێت، بۆچی بگەڕێمەوە؟!

* نەخێر، چونکە من نازانم خۆم لەکوێدام.. تا نەخشە سوودم پێبگەیەنێ.

لە چاو سێ وەڵامەکەی تردا چوارەمیان لە هەموویان راستترە، ئەی ئایا ئەزانی کەی ئەگەیتەوە شوێنەکەی یەکەمجارت؟ دیسان نەخێر، چونکە ئاراستەی رۆیشتنت دیار نییە، نازانی بەرەو کوێ دەڕۆیت، هەر لە خۆتەوە هەنگاو دەنێیت، لەوانەیە پاش شەو و رۆژێك رێکردن هێشتا هەرلەشوێنی خۆتدا بیت، ئەگەر مرۆڤ نەزانێ خۆی لە کوێدایە هەرگیز هیچ نەخشەو پلانێك سوودیی پێ ناگەیەنێت. کەواتە:

هەنگاوی یەکەمی دەستپێکردن ناسینی حاڵی ئێستای خۆتە، تۆ ئێستا لەچ ئاستێکدایت؟ دەتوانیت بە خاڵ ئەژماری بکەیت؟ دەتوانی بینووسیت؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کە زۆربەی خەڵك لە وەڵامدانەوەی دەسەوسانن.. ئەنتی NLPیەکانیش ئەمە ئەکەنە رەخنە لە پرۆگرامسازی دەروونیو دەڵێن: یەکێك لە کێشە سەرەکییەکانی مرۆڤ ئەوەیە کە ناتوانێ ئاستی سفری خۆی بزانێ تا لە یەکەوە دەست پێ بکات، زەمەنی سالبی خۆی ناناسێ تا لە موجەبەوە دەست پێ بکات، (مەبەست ئەوەیە رابردووی خۆی ناناسێو ناتوانێ راڤەی بکاتو تێی بگات تاخاڵە لاوازەکانی خۆی دیاری بکاتو بتوانێ رێگاچارەیان بۆ بدۆزێتەوەو نەخشەسازی بۆ داهاتووی خۆی بکێشێت).

هەنگاوی دووەم: دیاریکردنی ئاراستەی رۆیشتنتە بۆ پێشەوە، دیاریکردنی ئامانجتە تا بتوانی ئاراستەی بەرەوپێشچوونت دیاری بکەیت.

هەنگاوی سێیەم: گرتنەبەری میکانیزمی جێبەجێکردنی ئامانجەکەتە، لەم کاتەدا بە گوێرەی واقیعی ژیانی خۆتو گەورەیی پرۆژەی خوازراوت ئەتوانی کاتی گەیشتن بە ئامانجەکەشت بزانی.

جارێکیان لوقمانی دانا گەیشت بە هەرقلی پاڵەوان لێی پرسی: نهێنی سەرکەوتنی تۆ لە زۆرانبازیدا چییە؟ چ شتێك لە تۆدا هەیەو لەبەرامبەرەکانتدا نییە؟ وا تۆ بوویتەتە پاڵەوانو ئەوانیش زەبوون؟ هەرقل ئەڵێ: بەمەرجێ پێت دەڵێم تۆش نهێنی دانایيو حیکمەتی خۆتم پێ بڵێیت؟ لوقمانیش دەڵێ: باشە بەڵام تۆ یەکەمجار بڵێ.. هەرقل دەڵێ: پەنجەت بخەرە دەمم، منیش پەنجەم دەخەمە دەمت، تۆ گاز لە پەنجەی من بگرەو منیش لە پەنجەی تۆ، ئینجا پێت ئەڵێم، لوقمانیش وا دەکات، بەڵام هەر زوو هاواری لێ هەڵئەسێ کە پەنجەی ئێشی پێ گەیشت، هەرقلیش وازی لێ دەهێنێ، ئینجا لوقمان دەپرسێ، نهێنی ئەم کارە چی بوو؟ هەرقل دەڵێ: هەموو نهێنی سەرکەوتنی من ئەوە بوو کە بینیت، کە تۆ گازت لە پەنجەی من ئەگرت منیش ئازارم هەبوو، بەڵام زیاتر ئارامم گرت تا تۆ ئارامت لێبڕاو هاوارت کرد، کەواتە تۆ دۆڕانتو من بردمەوە، هەمیشە ئارامگرتنی من زیاترە لە ئارامگری بەرامبەرەکانمو بەو شێوەیە هەردەم من سەرکەوتووم بەسەریاندا! ئێستا تۆ پێم بڵێ: نهێنی حیکمەتو دانایی تۆ چییە؟ لوقمانی داناش بە هەرقل دەڵێ: پەنجەت بخەرە دەممەوە، ئەویش وا دەکات، یەکسەر لقمان بە توندی گازی لێئەگرێ هەتا هەرقل هاواری لێهەڵئەسێ، ئیتر لوقمانی حەکیمیش بەری ئەدات، ئەویش ئەپرسێ: ئەمە واتای چییە؟ نهێنی ئەم کارە چی بوو؟ لوقمانی حەکیمیش دەڵێ: کە من وتم پەنجەت بخەرە دەمم، بۆچی خستت؟ بۆ بیرت نەکردەوە ئەشێت گازی لێ بگرم، هەموو نهێنی دانایيو حیکمەتی منیش لەوەدایە: پێش ئەوەی هەر کارێ بکەم بیری لێئەکەمەوەو هەڵی ئەسەنگێنم ئەگەر داهاتووی روون نەبوو یان خراپ بوو نایکەم ئەگەر لێی دڵنیا بوومو باش بوو ئینجا جێبەجێی ئەکەم.

جیاوازی نێوان زیرەکیو گێلی، بێ هەڵەیی زیرەکەکان نییە، تەنها ئەوەیە کە زیرەکەکان هەمان هەڵە دووبارە ناکەنەوە. دەبێ هەمیشە ئەوەت لەبەرچاو بێت ژیان مامەڵەیەکە بۆ بەدەستهێنانی هەرشتێك، ئەبێ شتێك ببەخشیت، هەر هەنگاونانێك بەرەوپێش، هەر جۆرە سەرکەوتنێکی ماددی

یان مەعنەوی، یەکسانە بەو باجو حیرمانو نارەحەتییەی کە لەپێناویدا ئەچێژرێت، ئەگەر ورد بیربکەیتەوە دەتوانی بڕیار بدەیت، ئایا ئەوەی بەدەستی دەهێنی لەوەی لەدەستی ئەدەیت بەنرخترە یان نا؟! ئەو وەڵامەت ئەبێ ببێتە سەنگی مەحەکی جوڵەو بزاوتنەکانت·

هەر لە تۆوێکەوە هەتا گەورەترین درەخت چەندە پلەی هەیە؟! سروشتی توانای ئادەمیزاد زۆر لەوە زیاتر پلەی هەیە! ئایا لەچیداو چۆن سەرفی ئەکەیت؟ ئەو ئامانجەی بۆی ئەکۆشی ئەو هەموو قوربانییە ئەهێنێ کە پێی ئەبەخشی؟ هەر بۆ نموونە: هاوڕێی وامان هەیە شەوو رۆژ زیاد لە ٥ کاژێر بە دیار زنجیرە دراماکانی تیڤییەوە دادەنیشێ، گەر پێی بڵێی بەرامبەر بەو کاتە زۆرەی بە ئەڵقەکانی ئەو درامایانەی ئەبەخشی، چیت دەست ئەکەوێ؟ لەوانەیە زۆر بە سادەیی بڵێ: خۆشە؟! کە راستیش ئەکات، بەڵام ئەم خۆشییە زۆرترینی بەرهەمی راڤەی هەڵسەنگاندنی ئەو هاوڕێو دۆستانەیەتی کە پێشتر سەیری ئەو زنجیرانەیان کردووەو گەیشتوونەتە ئەوەی کە چێژبەخشن، کەواتە ئەکرێ بڵێین ئەم بۆچوونە کەمی هی خۆیەتیو زۆرتری لاسایی کردنەوەیە (Samuel Johnson) ئەڵێ: هەتا ئێستا هیچ کەسێ لە رێی تەقلیدەوە نەگەشتۆتە ئەنجامێکی گەورە·· ئەگەر نەزانێ وەڵامێکی قەناعەت پێکارت بداتەوە، ئەوا خراپە، چونکە وەك نموونەکەی سەرەتا وایە، بەڵام ئەگەر هەمان پرسیار لە (Orson Wellos) بکەین ئەوا ئەڵێ: دیمەنە زنجیرەییەکانی تەلەفزیۆن لە فستقو کەستانە دەچێ، رقم لێیانە بەڵام لەبەر دەستم دابێ خۆم بۆ ناگیرێو خێرا خێرا دەیخۆم! هەر ئەوەندەیە خوت پێوەگرت ئیتر هۆگری دەبیتو لەگەڵ کاراکتەرەکاندا وەك هاوڕێت لێدێتو بەردەوام حەز دەکەیت هەواڵیان بزانیتو لەخۆشیو ناخۆشییان ئاگادار بیت، (Horace Mann) ئەڵێ: (خوو)، لە گروپێك دەچێ هەر رۆژێ ریشاڵێکی ئەچنینو لە کۆتاییدا، هێندە بەهێز دەبێت کە ناتوانرێ بپچڕێنرێت·· هەر بۆیە ئەوانەی کە تووشی خووی خراپ دەبن بە راستی گیرۆدە ئەبن· زانای بەناوبانگی فیزیك نیوتن بە وانەی دەیانپرسی کە چۆن داهێنانە گەورەکانی کردووە، ئەیوت «هەمیشە بە بیرکردنەوە لێیان» ئایا تۆ لە بیرکردنەوەکانت سوود وەردەگری؟ چونکە داهاتووی هەر مرۆڤێك بەندە بە کرداری ئێستایەوە، (Antony Robbins) ئەڵێ: بە رای من یەکێك لە گرنگترین وانەکانی ژیان، فێربوونی تێگەشتنە لە بۆچی کارکردنی ئەو شتانەی کە کردوومانە·· تێگەیشتن لە رابردوو فێری دانانی بەرنامەی داهاتووت دەکات·

کێشەو گرفتەکانت ئەگەر حاڵنو شوێنیان ناو دەروونتە هەوڵمەدە بیانگۆڕی بۆ شێوەی گوفتاری سەر زمان، چونکە هیچ کەس بۆ ئەوە نییە رازی دڵتی بۆ بگێڕیتەوە، رازی دڵت بۆ دەریا بگێڕەرەوە ئەیکاتە شەپۆل، بۆ قامیشەڵانی باس بکە ئەیکاتە ئاواز، بۆ زستانی باس بکە، ئەیکاتە تۆفانو هەموو دنیا تێئەگەیەنێ، کێشەکەت هەرچی هەیە بیناسە، هەوڵەکانت بۆ دۆزینەوەی رێگاچارە بخەرە گەڕ، باشترە لە تەعبیرکردنی بە زمان، چونکە زۆرجار زمان نامەحرەمە بە کێشەکانی دڵ، ئەگەر هەر ناچاربوویت باسی بکەیت تەنها گازەی رۆحت لەسەر بەرماڵو روو بەخوا بێت، گەر بۆی کردی نایداتەوە بە رووتداو بۆیشی نەکردی لای کەس سوکت ناکات، «زوبێری گزندوزاڵپ» یەکێك لە تەلەبەکانی بدیع الزمانە، هەڵسەنگاندنەکەی لە بارەی زەمینە سازکردنی نارەحەتی، بۆ دەوڵەمەندکردنو بەرفراوانکردنی جیهانی رۆح، تا بڵێی جوانە، کە ئەڵێ: هیچ ناتەواوییەك نە لە جەستەتدا، نە لە بیروهۆشی تۆدا نییە· ئەوی تۆ دەترسێنێت ئەو نارەحتیانە نییە کە دێنە سەر رێت، بەڵکو بیرکردنەوەیە لێیان، پێش ئەوەی یەخەتبگرێ· بیرکردنەوە لە نارەحەتی گەوجییە، بیرکردنەوە لە مەسەلەکە پێویستە، بەڵام نابێ لە گوێی خەمو پەژارەدا بمێنینەوە، بیرکردنەوە، دادگایکردنو لێپرسینەوەو نیگەرانبوون، چەند بارودۆخێکی لەیەکتر جیاوازن، مانای بیرکردنەوە، دوای دیاریکردنی چۆنێتی پێکهاتەی بابەتەکە، گرتنەبەری رێوشوێنی پێویستە بە هێوری· بێدەنگی خواناسێك لە بارودۆخێکی پڕ دەردو مەینەتیدا، رێبەری لێهاتوویو گەشەی جیهانی رۆحیو بەرەوپێش چوونێتی··» ئایا بیرت کردووەتەوە لەوەی چەند رێگایەك هەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانت؟ کام رێگاو چ شێوازێك هەڵئەبژێری کە زۆرترین ئەگەری سەرکەوتنی تیایە··؟ چونکە هەندێجار سەرکەوتن وەك: میوە وایە ئەبێ لێبکرێتەوە یان وەك خۆراك وایە ئەبێ لێبنرێت، ئینجا ئەخورێت، تا زەمەنێکی بەسەردا نەڕواتو پێنەگا ئامادەی بەکارهێنان نییە·· بۆ ئەمە تەنها کارامەیی خۆت گرنگە، (تۆنی بوزان)، دۆزەرەوەی نەخشەکانی بیروهۆشو خاوەنی تۆماری جیهانی IQ، یەکێك لەو پێنج کەسەی کە بە باشترین وتاربێژ دەستنیشان کرا، بیست تایبەتمەندی کارامەیی مرۆڤ بەم جۆرە ریزبەند دەکات:

١- خەون (لە سەرەتاوە ژیانی ئەنجامەکان)·
٢- ئارەزوو (پلەی خواستەکە)·
٣- بیروباوەڕ (باوەڕی سەرکەوتن بە دەست هێنان)·
٤- خۆ بۆ تەرخانکردن (ژیان بەپێی ئامانجەکەت)·
٥- پلان (نەخشەی ئەو رێگایەی دەتبات بەرەو ئامانج)·
٦- جێگیریی (شاندانەبەر دژوارییەکان)·
٧- پەندوەرگرتن لە هەڵەکان·
٨- زانیاری بابەتەکە (زانیاری تەکنیکی پسپۆڕ)·
٩- خوێنەواری بیروهۆش (زانینی چۆنێتی کارکردنی مێشك)·
١٠- هێزی خەیاڵ·
١١- هەڵوێستی ئیجابی (گەشبینی، تێڕوانینی ئیجابی)·
١٢- خۆهاندان (قسەی ناخی هێز بەخش)·
١٣- توانای تێگەیشتن (دۆزینەوە رێژەی بەدی هاتنی ئامانجەکەت)·
١٤- کۆمەڵەی مێشك لێزان (دەستەو چوار دەوری نزیکی)·
١٥- مێشك لێزان/ ناخی (شێوازی رۆڵی کارامەیی، قارەمانەکەی)·
١٦- راستگۆیی راستەقینە (بەرامبەر خۆیو کەسانی تر)·
١٧- رووبەڕوونەوەی ترس/ ئازایی بە جەرگی·
١٨- داهێنەری/ بەدەستەوە هاتنی توێژینەوەی جیاواز·
١٩- خۆشویستنی کارەکەت·
٢٠- وزە (جەستەیی، فیکری)·

(ئیگناسی پادێرۆسکی) ژەنەری پیانۆو ئاواز دانەری پۆڵەندی، تەنانەت لە دوا ساڵەکانی کارکردنیدا کە گەیشتبووە لوتکە هەموو رۆژێ بێ وەڕەس بوون هەشت کاژێر لەسەر پیانۆ مەشقی ئەکرد· بێ ئەوەی خۆی بداتە دەست لوتکەی سەرکەوتنەکەی بە گەرموگوڕیو ئارەزوومەندانە بە درێژایی رۆژگار مەشقی ئەکرد، وتەی ئەم ئاوازدانەرە پەندێکی گرنگی تیایە بۆ ئەو کەسانەی کە لوتکەیان کردۆتە مەبەستی خۆیان، نەك بەرەو لوتکە چوون بکەنە رێڕەوی ژیانیان، کە دەڵێ:

"گەر رۆژێ مەشق نەکەم، هەست بەمە ئەکەمو لە خۆم دائەبینم·

گەر دوو رۆژ مەشق نەکەم: دۆستەکانم هەستی پێ ئەکەنو ئەیبینن·

گەر سێ رۆژ مەشق نەکەم: ئەمرین، گوێگرەکانم هەستی پێ ئەکەنو ئەیبینن"·

# ئاسۆی وێنەیەك

سەرنجی ئەم وێنەیە بدەو بە دیدو خەیاڵی تیژو هەستی ناسکت بۆی بنوارەو پاشان خامەکەت هەڵبگرەو گوزارش لەو هەستە ناسکو خەیاڵە وردو سۆزە بێ سنوورەت بکە، تا ببیتە خاوەنی یەکێك لەم دوو خەڵاتەی خوارەوە:

- بەشداری بێ بەرامبەری ساڵێکی گۆڤاری بڕیار.
- بەشداری بێ بەرامبەری شەش مانگی گۆڤاری بڕیار.

دوا مۆڵەتیش بۆ وەرگرتنی وەڵامەکان (١٠) رۆژ دوای دەرچوونی گۆڤارەکەیە.

## خەڵاتی یەکەم

هەردی صدیق - زانکۆی سلێمانی

بە تەنهایی
لە باوەشی ئاسمانێکا
ئەم شەو نوقمی سەفەرێکم
بۆ وڵاتێکی بێگانە..!
لێم زیز مەبە کە جێت دێڵم
ئەی شارەکەم...
ئەم سەفەرەم
بەرهەمی نوێی خەمەکانە..!
خۆ ئەزانی باڵندەیەکی ژێر چەپۆکی دڕەندە
سەختە بژی
لەپایزدا بەبێ لانە..!
بەڵام گیانە... کە ڕۆیشتم
بەدڵا تەنگی بۆم مەڕوانە
بەهیواوە چاودڕێم بە
ئەگەر قەدەر ڕێگەم بدات
هەردێمەوە..
وڵاتی من
تەنها خاکی کوردستانە..!

# راهێنانی مێشك

به وردی لەم وێنەیە
ورد بەرەوەو
هێزی مێشك‌و بیركردنەوەت
بخەرەكار،
بزانە چی دەبینیت؟
تا چ رادەیەك دیدی تێڕوانینت وردە؟



خێزانی بەختەوەر

پەری شێخ کەریم



# ئەو هەڵانەی ئافرەتان دەیکەن و ژیانی خۆیانی پێ تێک دەدەن!

زۆرجار وا هەست دەکەیت کە تۆو هاوسەرەکەت لە دوای چەند ساڵێکی ژیانی هاوسەرێتی لێک دوورن، چ هۆکارێک وای لێکردویت کە راوبۆچوونەکان و ئارەزووەکانتان ناهەوسەنگن؟ ئایا رۆژێك لە رۆژان بیرت کردۆتەوە کە تۆ هۆکاری سەرەکی ئەم ناهەوسەنگییەیتو دەتوانیت بە ڕەفتارو وتە جوانەکانت لەگەڵ هاوسەرەکەتدا ژیانی هاوسەرییتان بگۆڕیت؟ بێگومان نا! چونکە تۆ سووری لەسەر کردەوەکانی خۆتو هەمیشە بە هەڵەی هاوسەرەکەتی دەزانیتو دەڵێیت: پیاوان بەگشتی بەو شێوەیەن: بێبایەخو بێوەفان، بەرامبەر خێزانەکانیان! لەکاتێکدا رەنگە هەندێ هەڵە یاخود کەمتەرخەمیت وایکردبێ کەهەمیشە لە ماڵەوە رادەکاتو پەنا بۆ تەنیایی دەبات.

لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لەسەر ژمارەیەك لە پیاوان ئەنجام دراوە کە جیاوازبوون لە: تەمەنو ئاستی خوێندەواریدا، بۆ ئەوەی پرسیاریان لێبکرێت لە بارەی ئەوهەڵانەی کە ژیانی هاوسەرێتی بەرەو کێشەو ناکۆکی دەبات، لە ئەنجامدا دوای کۆکردنەوەی پێشنیارو رەخنەکانیان لێکۆڵینەوەکە ئەوە دەسەلمێنێت کەزۆر جار هەڵەکانی ئافرەت دەبێتە مایەی دابڕانی خێزانو دروستبوونی ناکۆکی رۆژانە، هاوکات لەگەڵ گەورەبوونی خێزاندا کێشەکانیش گەورەدەبن.

١- زۆر جار ئافرەت هەموو سەربەستییەکی هاوسەرەکەی دەخاتە ژێر ئارەزووی خۆیەوە.

٢- بەردەوام چاودێری تەلەفۆنو هاتنو رۆیشتنی هاوسەرەکەی دەکات، بەمەش کێشە دروست دەبێ، چونکە هەندێجار شتێك هەیە کە پەیوەندی بە خێزانەکەیەوە نییە.

٣- بایەخ نەدان بە راوبۆچوونی هاوسەرەکەی کۆنترۆڵ کردنی بڕیارەکان لە ژێر دەستی خۆیدا، ئەمەش هۆکاری سەرەکییە بۆ نەمانی رێزو دروستبوونی ناکۆکی.

٤- پێشنیارێکی تریان ئەوە بوو زۆربەی ئافرەتان لە کاتی چوونە دەرەوەیاندا پرس بە هاوسەرەکانیان ناکەن دەڵێن: ئایا دەبێت ئێمە بۆ شوێنێك بچین یاهەر کارێك بکەین، پرسی هاوسەرەکەمان بکەین.

٥- درکاندنی نهێنی، پیاوان بە گشتی حەز دەکەن کە خێزانەکانیان نهێنی ماڵەکەیان بپارێزین.

٦- نەپاراستنی پاکو خاوێنی ماڵو منداڵ، لەبەرئەوەی کاتێك هاوسەر بەوپەڕی ماندوویەتییەوە دەگەڕێتەوە حەز دەکات ماڵو منداڵەکەی بە ڕێکو پێکی ببینێت نەك بە ناڕێکی، چونکە دەبێتە مایەی توڕەبوونی هاوسەرو دروست بوونی ناکۆکی نێوانیان.

٧- زیادەڕەوی لە پارە سەرفکردندا ئەمەش هەڵەیەکی ترە کە زۆربەی هاوسەران نارەزایی دەردەبڕن کە خێزانەکانیان نرخ بۆ ماندووبوونی هاوسەرەکانیان دانانێنو ئەو شتانەی زۆر گرانبەهان دەیکڕن.

٨- لەکاتی گەڕانەوەی هاوسەرەکەیاندا نارەزای دەربڕینو دەنگە دەنگ کردنو کەمتەرخەمی و شێواوی شتومەکەکان دەبێتە هۆی راونانی هاوسەر لە ماڵ، ئەمەش کارێکی هەڵەیە ئافرەت دەبێت هەوڵ بدات هاوسەرەکەی کاتێك دەگەڕێتەوە ماڵەوە ماندوێتی دەربچێت نەك زیاتر ماندووی بکات!

٩- ستایش کردنی پیاوانی تر لە لای هاوسەرەکەی وەك: تۆ کەسێکی بێ توانای، فلانە کەس چەندە دەوڵەمەندە یا زیرەکە! بەڕاستی هەموو هاوسەرێك حەز دەکات کە خێزانەکەیان ستایشیان بکەن لە کارەکانیانداو بە ماندوێتی هاوسەرەکانیان بزانن.

١٠- لەکۆتاییدا هەموو هاوسەرێ حەز دەکات خێزانەکەی ئاسوودە بێو ژیانێکی ئاسوودە لە نێو ماڵەکەیاندا هەبێ، پڕ بێ لە ڕێزوخۆشەویستیو وەفاداری، هەمیشە هاوسەرەکەی بەلاوە بە نرخو بە بایەختر بێ لە هەموو کەسانی تر.



# هونەری هاوڕێتی

**زاهیر زانا**

ژیانی مرۆڤ لە چوارچێوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیدا دەگوزەرێت، هاوڕێیەتی وەك پەیوەندییەکی سەرەکیو کاریگەرو پێویست رۆڵێکی گرنگی هەیە لە ژیانی هەریەکێکماندا‌و رەنگە کەسانێکیش نەبن هاوڕێیان نەبێتو لەم پەیوەندییە بێ بەش بنو تەنانەت دەبێت مامەڵەیەکی هاوڕێیانەمان لە تەك خودی خۆشماندا هەبێت، ئەگەر بیرێك لەرابردووی ژیانی خۆمانو هاوڕێکانمان بکەینەوە کتوپڕ چەندین پرسیار ختوکەی هەستمان دەداتو بیرکردنەوەمان دەهەژێنێت، فلان هاوڕێ زۆر خۆشەویستە؟ یا رەنگە دڵمان لە هاوڕێیەکمان گەردی گرتبێت، چی وای لەو هاوڕێیەمان کردووە زیاتر لە دڵماندا شوێنی هەبێت با ئێمەش ئەو جۆرە سیفەتە لە خۆماندا گەشە پێ بدەین، لەگەڵ هاوڕێکانماندا بەو شێوە مامەڵەبکەینو لەو هەڵسوکەوتەش دورکەوینەوە کە دڵی ئێمەی تەنگ کردووە تا ئێمەش کەسانێکی تر ئازار نەدەین، با ئەوپرسیارە لەخۆمان بکەین ئێمە بۆ هاوڕێکانمان چۆنین؟ ئایا توانیومانە رۆڵی راستەقینەو دڵسۆزانەی هاوڕێیەتیمان ببینین؟

هاوڕێیەتی پەیوەندییەکی زیندووەو رۆڵی کاریگەری هەیە لەسەر ژیانمانو دەبێت تەواو لێزانانەو دانایانە رەفتاربکەین بۆ هەڵبژاردنی هاوڕێی شیاو و شایستەو دڵسۆزو بە وەفاو خاوەنی رەوشتە بەرزو باڵاکانو پاراستنی ئەم پەیوەندییە بەشێوەیەکی دروستو رێكوپێك بۆ ئەوەی دەروونێکی ئاراممان هەبێتو ژیانێکی بەختەوەرانە بگوزەرێنینو بوونمان بۆ یەکتر ببێتە مایەی خۆشبەختیو خۆشەویستیو دڵسۆزیو یەکتردۆستی بگۆڕینەوە، دەبێت بزانین مرۆڤی تاكو دابڕاو بێ هاوڕێ ناتەندروستە، بەڵام ئەو کەسەش کە هاوڕێی نەشیاوی هەیەو پەیوەندی هاوڕێیەتی لەگەڵ هاوڕێکانیدا بێ بەهرەو هونەری هاوڕێتییەو دڵسۆزیو خۆشەویستیو راستگۆی تێدا نییەو بەرژەوەندی پایەی هاوڕێیەتیانە زۆر ناتەندروسترەو پێویستی زۆری بە بەخۆداچونەوەو چاکسازییە لەم بوارەدا، لە پێناو هاوڕێیەتییەکی دروستو سەرکەوتوو بەرهەمدار چەند خاڵێك دەخەینە ڕوو:

* هاوڕێی کێیتو کێت هاوڕێیە؟ زۆرجار بەو کەسانە پێوانە دەکرێین کە لەگەڵیاندا هاوڕێین وەك وتراوە: (پێم بڵێ هاوڕێی کێیت؟ پێت دەڵێم تۆ کێیت)، چونکە خوونەریتو بیرکردنەوەمان وەك ئەو کەسانەی لێدێت کە هاوڕێمانن، بۆیە هەڵبژاردنی هاوڕێ کارێکە پێویستی بە کارامەییو وردبینیو شارەزاییو هەڵسەنگاندن هەیەو هەموو کەس بۆ ئەوە ناشێت بیکەیت بە هاوڕێت.

* دڵسۆزبە بۆ هاوڕێکەت وەك چۆن بۆ خۆت دڵسۆزی بۆ کاری باشو بەسود رێنمایی بکەو بە سەرکەوتنەکانی دڵخۆشبەو لە تەنگانەدا هاوبەشی بە.

* راستگۆیی لە نێوان تۆو هاوڕێکەت متمانە زیاد دەکاتو هاوڕێیەتیش بێ متمانە هیچ مانایەکی نییە.

* لەبەرامبەر کارە باشەکانیدا سوپاسی بکەو دەستخۆشی لێبکەو لە کەمو کورتییەکانی ببورە.

* ئەگەر هەڵەیەکت ئەنجامدا داوای لێبوردن بکەو ئەگەر داوای لێبوردنت لێکرا بە سنگی فراوانەوە وەریبگرە.

* هەرگیز بە تەنها هەڵوێستێکی هاوڕێکەت هەڵمەسەنگێنەو راستوچەپی پیامەهێنەو لەناو لاپەڕەی سپیدا تەنها خاڵی رەشی مەبینە، ئەگەر تەلەفۆنێکت بۆ هاوڕێیەکت کردوو وەڵامی نەدایتەوە، بڵێ رەنگە ئاگای لێ نەبێت یا بە کارێکەوە زۆر سەرقاڵ بێت، ئەو کاتانە بهێنەرەوە بیری خۆت کە هاوڕێکەت بەوپەڕی دڵسۆزییەوە یارمەتی داویت، ئەگەر داوای کارێکت لێکردو بۆی نەکردیت بزانە رەنگە ئەو کارە هەر لە توانای ئەودا نەبووبێت ئەنجامی بدات، شتێکیش لەسەرو تواناوە لە کەس داواکراو نییە.

* لە کاتی تەنگانەو ناخۆشییەکاندا بەوپەڕی تواناو دڵسۆزییەوە یارمەتی هاوڕێکەت بدەو پشتی بگرەو بەرەو چارەسەری گرفتەکان رێنمونی بکە.

* سەربەخۆیی کەسی هاوڕێکەت بپارێزەو رێز لە بیروبۆچوونەکانی بگرەو بیروبۆچوونی خۆتی بە سەردا مەسەپێنەو بوونی وەکو تاکێکی سەربەخۆ بپارێزەو بزانە هەرکەس خاوەن تایبەتمەندیو سەربەخۆیی کەسی خۆیەتی نەك بتەوێت بیکەیتە سێبەرو فۆتۆکۆپی خۆت.

یوسف واژەیی

# بۆ دایکە میهرەبانەکەم!

## [دڵۆپەیەك لەدەریای ئەمەك‌و پێزانینی رۆڵەیەك بۆ دایکەکەی]

پێنوسەکەم دلگران‌و دەفتەرەکەم نیگەرانە کە ئەمەوێ لە تۆ بدوێم، چیبکەم بۆ ئەوەی شایان بەو بلوێم باسی تۆ کەم، جا چۆن لەخۆم رادەبینم، تاکو ئەو هەموو جوانییەی لە دڵی تۆ رادەبینم بیخەمە سەر دڵی کاغەز، بە کام ئاوەز، بە کام ئاواز بتلاوێنم، خەمی دڵ و تەمی دڵت بتاوێنم، چۆن بە خۆمی بدەم مافێ لێبدەم لازو گەزافێ، تا خاوەنی سینەی ساف‌و بە ئینصافێ بناسێنم، هەتا ئەوەی کە ناتناسێ بتاسێنم.

ئەی ئەو کەسەی دڵت وەکو دەریای بێ بن پڕ لە هەڵچوون‌و داچوونی شەپۆلی سۆز، باخی دەروونت هەمیشە سەوزو نەورۆز، ئەی ئەو کەسەی دڵت گوڵ‌و ناخت باخ‌و رەنگت شەنگە، بەو سیما جوان‌و بێدەنگە، هەزاران پەیڤ‌و پەیامی خۆشەویستی‌و سەدان خەمی هیوابوونی بە ژیانی من تێدا پەنگە، بەو دڵە جوانەی کە بۆ من هەم هیوادارە هەم تەنگە، هەزاران زمانی پاراو، سەدان کتێبخانەو پەڕاو باسی تۆیان بۆ ناکرێ، وەسفی تۆیان بۆ نادرێ، چونکە ئەوەندە مەزن‌و کاریگەری، لە سنوری وەسف‌و پێناسە بەدەری، ئەی میهرەبان، کام سەمفۆنیا وەکو لای لایەی شەوانت ئارام بەخشە، کامە تابلۆ وەك دڵی تۆ خۆشەویستی لەسەر نەخشە، کامە جێگەو خانەو لانە وەك ئامێزت گەرم‌و گوڕە، کامە کەپرو کامە کانی وەکو کانی‌و سایەی سینەت تینوێتی‌و ماندوویی بڕە، خۆشەویستم، هەناسەی پڕ لە تاسەی تۆ باوەشێنی دڵی پڕ لە کوڵی منە، خونچەی لێوی بە لایە لایە بزێوی ئاڵوگەشت چرۆی هەمیشە بەهارو گوڵی منە، گەرمی لەش‌و نەرمی هێلانەی باوەشت، سەکۆی ئاسودەیی بەخش‌و تینی منە، مەکۆی ئارامی‌و پەرژینی ژینی منە.

دڵسۆزەکەم، نازەنینە بەسۆزەکەم، من گریانم پێشکەش ئەکردی‌و تۆش خەندە، لە من لاساری‌و ناسازی‌و لە تۆش ئەو نزا جوانانەی کە پەسەندە، دوعای تەمەن درێژیم‌و ئەوەی سەربەرز بژیم‌و ئەو خواست‌و داوا چاکانەی کەوا خۆشی منی بەندەی لەسەر بەندە، بە کام پێوەرو مەزەندە بزانم دڵی دایکێتیت، عەشقت بۆ من‌و پاکێتیت چۆنەو چەندە.

ئازیزەکەم، ئاگادار بووم کە شەوانە دڵی نەرمت بۆ من ئەکردە جۆلانە، هەتاوەکو بە ئارامی تیا پاڵ کەوتم، نەسرەوتی تاکو نەسرەوتم، گەر تۆ نەبای چۆن ئەخەوتم، کێ ئەیتوانی بکا زەوتم، کێ وەك تۆ دڵی ناسکی دا ئەخورپا کە ئەکەوتم، کێ وەك تۆ شاگەشکە ئەبوو کاتێ کەوا سەرئەکەوتم، کە ئەتبینی دارە دارەو جووڵەو رەوتم، تا گیانیشت پێئەکەنی کە گوێت لە گڕوگاڵم بوو، لە ناخەوە هەڵئەقرچای کە گریەو ناڵە ناڵم بوو، شیرینەکەم، کە ساوا بووم، بەو شێوەیەی وتم وابوم، ماڵی دڵت تەنها منی لە ناوا بووم، لە تۆی گوڵم خاوەن هەزاران داوابووم، هەمووت بۆ جێبەجێ کردم، هەر جوڵام رووت تێئەکردم، رێزت لێنام هێزو وزەو سۆزت پێدام، لە ناو قەفەسی زێڕینی سینەتا بەندت کردبووم، ئەو بولبولە رەنگاو رەنگ‌و دەنگ خۆشە بووم بۆ خۆت پەسەندت کردبووم، بەڵام ئێستا من گەورە بووم، مرۆڤێکی هەڵکشاوم بە باڵاو تەمەن تەواوم، زۆر گۆڕاوم، بەڵام تۆ هەر نەگۆڕاوی هەروەك جاری جاران ماوی، خاوەنی هەمان رەوشت‌و دڵ و چاوی، خاوەن هەمان دەست‌و هەستی، ئەوەی زیانی بۆم هەبێ رێی لێ ئەبەستی، خۆت کردۆتە خاوەنی تەواوی من‌و هەموو کەسم، بە گەورەیش بولبولەکەی ناو هەمان سینەو قەفەسم، خۆت کردۆتە قەڵغانی من پەرژین‌و پاسەوانی من، قەڵای رۆژو شەوانی من، هەزاران جار خۆت ئەکەیتە قوربانی من، هێندەت بە سینەوە گوشیم، لە باوەشتا هەڵت گوشیم، ئەزانم ژمارەی ترپەی دڵت چەندە، بە شەپۆلی دەریای دڵت ئاشنا بووم.

بۆیە کە دوور ئەکەومەوە وا هەست ئەکەم بێ پەنا بووم لە ناو غوربەتا فەنا بووم.

هەر سەرەتا من شارەزای هەموو شوێن‌و هەرێمێکی نیشتمانی تۆی دایك بووم، چونکە لەسەر کورسی‌و تەختی پایتەختی دڵی خۆشبەختی خۆتا بە جوانی داتنا بووم، ئەو رۆژانەی کە کۆرپە بووم لانکەی دڵت هەواری رۆژو شەوم بوو، کەژاوەی دوور لە ئاژاوەی بێداری‌و کاتی خەوم بوو، بە دەسرازەی خۆشەویستی بێ ئەندازەو میهرەبانیت داتبەستبووم، وەها لەو جێیەت خستبووم کە گەورەش بووم داتنەگرتم، بەبێ نازی راتنەگرتم، چونکە تامن گەورە ئەبووم ئەویش فراوانتر ئەبوو، بۆیە هەر لەوێدا ماوم، لەبەر چاوم نەبێزراوم.

نازەنینم، تەنانەت پەروەردگاریش تۆی کردۆتە هاوسۆزی خۆی، هۆی تورە بوون‌و بەزەیی پیرۆزی خۆی، رازی بوونت رازی ئەوەو نیگەرانیت خەشمی بێ ئەندازەی ئەوە!

خۆشەویستم، بمبورە ئەوەی کە ویستم نەمتوانی بیکەمە نووسین، ئەوەی نووسیم تەنها دێڕێکی یاداشتە نەك پاداشتە، هەڵمی تنۆکێکی دەریای پێ زانینە نەوەك کارو لێ زانینە، خاڵی بوونی تەنها جارێ جامی دڵە نەوەك چێژو کامی دڵە.

چۆن بە ئەسرینی مەرەکەب بۆ قەترە شیری رەوان‌و ژیان بەخشت بەها دانێم؟

چۆن دڵۆپی رەش‌و سپی لە بەرامبەر یەکا دانێم؟

ئایا خۆشت پێت وانییە کە بێ توانام؟ دنیای فراوانی جوانیت قەڵەمی پێ کول کردم‌و هەنگاوی پێ شل کردم‌و دەفتەریشی پێ وەلا نام!

بەڵام ئەڵێم: بڵێی دایە مۆڵەتی بە من بدایە لە ژێر پێیەکانی ئەوا دەوارێکم هەڵبدایە، بۆ ئەوەی منیش گەشتیاری ناو بەهەشت بم، باڵندەی باخچەی بەهارو دەرودەشت بم.

# کیژۆڵەیەک هەست بە بەرپرسیارێتی دەکات



هێمن محمد علی

کیژۆڵەیەکی جوانکیلە بوو، بێدەنگو لەسەرخۆ بوو، بەڵام هەرجارێك کە دەتبینی هەستت دەکرد خەمێك رووخسارە پاکو جوانەکەی داگیرکردووە، ئەم کیژۆڵەیە لە پۆلی چوارەمی بنەڕەتی دەیخوێند، جلوبەرگەکانی هەژاریو نەدارییان پێوە دیاربوو، هەربۆیە زۆر تێکەڵی قوتابییە هاوەڵەکانی نەدەبوو، لەسوچێکی پۆلەکەیدا یان لە پەراوێزی گۆڕەپانی قوتابخانەکەیدا بە بێدەنگی دادەنیشتو سەری دەخستە نێوان هەردوو دەستە بچکۆلەکانییەوە، رۆژان رۆیشتو رۆژان هات، ئەم قوتابییە بووە جێگەی سەرنجی یەکێك لە کارگوزارە ئافرەتەکانی قوتابخانەکە، زۆر هەوڵیدا هیچ سەرەداوێکی بۆ دەرنەکەوت، گومانی کارگوزارەکە رۆژ بە رۆژ زیادی دەکرد، گومانەکەشی ئەوە بوو، بەیانیان کاتێك قوتابییەکە دەهات بۆ قوتابخانە، جانتای پەرتوکو تیانووسەکانی وەکو قوتابییەکانی تر، بەڵکو بەوە دەچوو لە جانتای قوتابییەکانی تریش سوك تربێتو کەمتری شت تێدابێت، بەڵام کاتێك نیوەڕوان دەرۆیشتەوە، دەیبینی جانتاکەی هەڵئاوساوەو بەوە دەچوو شتی زۆر تێدابێت، کارگوزارەکە چاری نەماو بۆ ئەو مەبەستە بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی ئاگادارکردەوەو ئەو بابەتەی تێگەیاند، کە ببووە جێگەی گومانیو ئەوەشی تێگەیاند کە زۆر هەوڵی داوە، بەڵام هیچ زانیارییەکی دەست نەکەوتووە.

بەڕێوەبەرەکەو کارگوزارەکە رێکەوتن، کاتێك بانگی قوتابییەکە بکەن، کاتی رۆیشتنەوەی مامۆستاو قوتابییەکان بێتو جانتاکەی بپشکنن، رۆژی دوایی، کاتێك دەوامی قوتابخانە تەواو بوو، کارگوزارەکە بە قوتابییە کچەکەی گوت: مەڕۆرەوە بەڕێوەبەر کاری پێتە، کاتێك ژووری بەڕێوەبەر چۆڵ بوو، قوتابییەکە هاتو وتی: مامۆستا گیان فەرموو... کارێکت هەیە؟! بەشێوەیەك کە هەست نەکات جانتاکەیان لە شانی کردەوەو سەیریان کرد، چی ببینن؟!

ئەو کچە بەستەزمانە جانتاکەی پڕکردبوو لە پاشماوەی لەفەی قوتابییەکان!! بەڕێوەبەر پێی وت: کچەکەم ئەمە چییە؟! ئەم شتانەت بۆ چییە؟ قوتابییە کچەکە چاوەکانی فرمێسکیان تیا قەتیس ماو بەدەم هەنسك دانەوە وتی: مامۆستا گیان، باوکم نەماوەو برای گەورەشم نییە کارمان بۆ بکات، تەنها دایکم بە جل شۆرینی ماڵانو نانکردن بۆ خەڵکی، ئەگەر پارەیەکی کەممان بۆ پەیدا بکات! چەند خوشكو برایەکی بچوکم هەیە، دەمەوێت بە پاشماوەی قوتابییەکان برسێتیان بشکێنمو خەندەو بزەیەك بخەمە سەرلێویان، کاتێك ئەم قسانەی کرد، بەڕێوەبەرو کارگوزارەکە حەپەسانو سەریان سوڕمابوو!

نەیان دەزانی ئەمە خەوە یان راستییە؟!

بەڕێوەبەر دەستی بەسەر قوتابییەکەدا دەهێناو بە دەستەکانی فرمێسکەکانی سڕیو پێی وت: ئیتر لەمڕۆوە تۆ کچی منیو هەموو مانگێك وەکو مامێك یارمەتیتان دەدەمو رۆژانەش لە حانوتی قوتابخانە خواردنو لەفەی پاك بۆ خوشكو براکانت بەرەوە...

خۆزگە هەموومان جارجارە چاوێك بگێڕینو بزانین لە دەوروبەرمان کێ هەژارو نەدارە؟! کێ بێباوکە؟!

بەهۆی ئەو بارودۆخەی چەندان ساڵە وڵاتمان پێیدا تێپەڕیوە، دڵنیام کەسانی هەژارو بێ باوکمان زۆرە، ئەوەی زیاتر ئەم کارەی پێدەکرێت مامۆستایانی قوتابخانەن، مامۆستا لە جێی باوكو دایکی قوتابیانە، ئەوان دەتوانن قوتابییە هەژارەکان بدۆزنەوەو هەر هیچ نەبێت دەستێك بەسەریاندا بێننو بەدیارییەکی بچوك خەندە بخەنە سەرلێویان.

حەزدەکەم فەرموودەیەکی پێغەمبەرمان (درودی خوای لێبێت) بیربێنمەوە کە دەفەرموێ: «منو ئەو کەسەی بێ باوکێك بەخێو دەکات لە بەهەشتا وەکو ئەو دوو پەنجەیە نزیکین (لەو کاتەدا ئاماژەی بۆ پەنجەی ناوەڕاستو شایەتومان کرد)، بەڕاستی مژدەیەکی زۆر زۆر گەورەیە.



# ئەركی پەروەردە

ئا/ بەهرۆز شێرزاد

پـەروەردە ئەركـی گـەورەو گرنگـی لە ئەسـتۆدایە، ئەو ئەركـەش تەنها یەك كاری دیـاری كراونییە، بەڵكو بە پێـی بارودۆخو هێڵی گشـتی سیاسەتی وڵاتو كەلتوری گەلو نەتەوەكانو.....هتـد، دەگۆڕێت، بەڵام ئەركی سـەرەكی پەروەردە لە هەمـوو كاتو وڵاتو گەلاندا چەسپاوو نەگۆڕە.

ئەركـی پـەروەردە زیاتـر كاركردنـە لەسـەر ئاراستەكردنو گۆشكردنو فێركردنی منداڵ، تەنهـا زانایانی دەرونزانیو بایۆلۆژی بەتەواوەتی سروشـتی مـرۆڤ (بەتایبەتیش منداڵ) دەزانن‌و دەناسن، زانا سایكۆلۆژییەكان دەڵێن: منداڵ بەگشـتی باربۆییە بە جۆرەها توانا لەسەر شێوازێكی رەفتاریانەی بۆماوەی بایۆلۆژیانە، هەر لە منداڵیو ساواییەوە توانای شیرخواردنو دەركردنی پاشەڕۆی هەیە، ئەمە وێڕای هەبوونی ئامادەگیو سازیاری دەربارەی پەسـەندكردنی خۆگونجاندن لەگەڵ ژینگەو دەوروبەر، بەڵام ئەم توانا شـاراوەیەی ناخی منداڵیـش هەر خۆڕسـكانە ناتەقێت، بەڵكو پێویستە بۆی بڕەخسێ، تاكو بتوانێت لەگەڵ ئەوكۆمەڵـەو خەڵكـەی دەوروبەریدا رابێت، ئەركـی پەروەدەش لێـرەوە دەردەكەوێ، واتا منداڵ لەگەڵ بوونیـدا، لەگەڵ هاتنە دنیاوە دوو شـتی تێدایە كە دەبنە بناغەی مانەوەو درێـژەدان بەژیانـیو كەڵـك وەرگرتـن لە پەروەردە، ئەوانیش بریتین لە:

١- هەبوونـی ئامادەگـی بـۆ وەرگرتنی ئاراستەو رێنومایییەكان.

٢- هەبوونـی توانـای شـاراوە بـۆ پراكتیزەكردن لە بوارە جیاوازەكانی ژیاندا.

جا لەبـەر ئەوەی مرۆڤ هەر لەنەژادیدا ئەم دوو شتە گرنگەی هەیە، كەواتە بە ئاسانی پرۆسـەی پەروەردە وەردەگیرێتو دەتوانێت كەڵـكو سـوود لـە پـەروەردە وەربگیرێت، ئیتر لێـرەداو لەم كاتەدا ئەركـی پەروەردە دەردەكەوێ، ئەویش لەم چەند خاڵەدا:

١- گواسـتنەوەی جـۆرە رەفتارییەكانی تاك لە كۆمەڵگـەدا: دیارە كۆمەڵگە بریتییە لـە جۆرەها مرۆڤ، هەریەكە لەو مرۆڤانەش رەفتارو شـێوەی تایبـەت بە خۆی هەیەو لە هی ئەوانی تر ناچێت، سروشتی ناخی مرۆڤ لە رەفتارو هەڵوێستەكانیدا دەردەكەوێ، ناخ هەرچۆنێك بێت شـاراوەو نادیـارە، پەنهانو نهێنییـە، هیـچ كەسـێك پـەی پـێ نابات، تەنانـەت جاری وا هەیە مـرۆڤ خۆی پەی بەرازونهێنیو توانا شـاراوەكانی خۆی نابات‌و رێیان ناباتە سـەر، واتە مـەرج نییە هەموو مرۆڤێك توانای خۆناسـینی هەبێت، كەواتە ناسـنامەی بەردەسـتو زانراو كـە یەكتری پێ دەناسـین‌و دەناسـینەوەو بڕیار لەسـەر جـۆری كەسـێتی یەكتری دەدەیـن بریتییە لە هەڵسـوكەوتو رەفتارەكانمـان، هەر ئەم رەفتارانەشـمانە بوونەتـە جـۆرە زمانێكی بێدەنگو هێمای بۆ یەكتر دواندنو ناسـینی خۆمان لە نێوان یەكتریدا، هەمیشە كۆمەڵ كار لە سەر ئەوە دەكات كە ڕەفتارە پەسەندەكانی تاكەكانی كۆمەڵگە بپارێزێتو بیانگوازێتەوە بـۆ نەوەكانی داهاتـوو، ئـەو رێگەیەش كە ئەم رەفتارانە هەڵدەكەنێتو دەیانگوازێتەوە بـۆ بەرەكانی دواتـری مـرۆڤ، بریتییە لە پەروەردە، جگە لە پەروەردە هیچ هۆكارێكی تـر نییە كـە بتوانێت رەفتار لەكەسـێكەوە بگوازێتەوە بۆ كەسـێكی تـر، رۆژانە خۆمان بەچاوی خۆمان ئەم راسـتییە دەبینین، وەك گواستنەوەی رەفتار لە دایكەوە بۆ منداڵەكەی، یـان لە باوكـەوە بۆ منداڵەكـەی، یاخود لە مامۆسـتاوە بۆ قوتابییەكەی، لە وەستاوە بۆ شـاگردەكەی..... هتد، لە راستیدا رەفتار لە هیچ كەسـێكەوە ناگوازرێتەوە بۆ كەسـێكی تـر، چونكە زۆربـەی ڕەفتـارەكان كردارین، هەڵوێسـتن، كارو باری میكانیكین، ئەمانەش پابەنـدن بە بڕیاری هـزری مرۆڤەوە، دەبێ مرۆڤەكـە بباتە ئەو قەناعەتەی كە رەفتاری خـۆی بگۆڕێت، ئـەم بڕیاردانەش پەیوەندی بە لایەنی تیۆریو چالاكی فكری كەسـەكەوە هەیە، كە (پەروەردە) لە رێی ئاراسـتەوە یان لە رێگەی ترەوە كار لە هزر دەكاتو مرۆڤەكە هانـدەدات بۆ پەیـرەو كردنی نەخشـەكەو پراكتیزەكردنی كە لەشێوەی رەفتاری كرداری یان رەفتاری هزریدا رەنگدەداتەوە.

٢- گواسـتنەوەی كلتـوری رۆشـنبیری لە نـەوە دێرینەكانـەوە بۆ نەوە تـازەكان، ئـەم كلتـورە بـەری رەنجی هـزری هەموو مرۆڤەكانـەو سـەرمایەیەكی سـەنگینی ئادەمیزادەكانـەو تایبەت نییە بە بەرەیەكی دیاریكراو، دەبێت قەدری بزانرێو بپارێزرێت، پاراسـتنەكەش بەوە دەبێت كە بگوازرێتەوە بـۆ بەرەو نەوەكانی داهاتوو، (پەروەردە) ئەو رێگە سـەرەكییەیە كە كرداری گواستنەوەكە ئەنجام دەدات، ئەم كلتورەش نابێت هەر لەو بارە كلاسـیكییەدا بمێنێتەوە، بەڵكو دەبێت دەوڵەمەنـد بكرێتو گۆڕانی بەسـەردا بێت، ئەمەش ئەركی ژمارە (٢)ی پەروەردەیە.

٣- گۆڕینـی كلتـوری رۆشـنبیریو راستكردنەوەی پێكهاتەكانیو زیادكردنی شتی بەسودو بژاركردنیو لابردنی شتە بێ سودەكان، لـە راسـتیدا ئەم ئەركـە تەنها یـەك ئەرك نییە، بەڵكو نجیرەیەك ئەركی لێكبەستراوەو هەمووشیان لە ئەستۆی پەروەردەدان.

٤- پێدانـی زانیـاریو شـارەزایی كۆمەڵایەتیانـەی نایـاب (تـاك) كـە لـە نەریتو رەوشـتو كلتورو سستەمو رەفتاری كۆمەڵایەتیانەی كۆمەڵگەكەیەوە سەرچاوەیان گرتبێ.

٥- پێدانـی زانیـاری نـوێ بـە (تاك)ی كۆمەڵگە.

بێگومـان گۆڕینـی كلتوری رۆشـنبیری كارێكـی ئاسـان نییە لـە سـەرەتادا، گەلێك كۆسـپو دژایەتی دێتە رێگـەی گۆڕەر، بەڵام مەرج نییە ئەوانە نیشانەی شكستی بن، نابێت ئەو هەڵوێسـتانە مرۆڤی گۆڕەر ساردبكەنەوە لە پرۆژەكەی، سروشتی كۆمەڵگە هەروایە زۆر درەنگ لە سـەر گۆڕانـكاری رازی دەبێتو لە

جێبەجێکردنییشدا سستە، کلتوری رۆشنبیری هەر گەلو نەتەوەیەکیش بۆ ماوەی ساڵەهای ساڵ دروست بووە، بە قوڵایی ناخی هزری کۆمەڵایەتیانەی تاکەکانی کۆمەڵگەدا ریشەی داکوتاوە، هەروا بە ئاسانی ئەو کلتورە ریشەکێش ناکرێت، دەبێت تاکەکانی کۆمەڵ رازی بکرێن بەو پرۆسەیەو خۆشیان هاوکاربن، جگە لەوەش گەلێکجار (راستکردنەوە) گرانترە لە گۆڕین، چونکە (گۆڕین) نیمچەکارەو زۆر دەستی مرۆڤ دەگرێتو کاتی زیاتری دەوێت، بەڵام (سەر لەنوێ دروست کردنەوە) کاری تەواوەو هەمیشە کاری تەواو سەرکەوتوترە لە کاری نیمچەکار.

کاری بژارکردنی کلتورو دانانەوەی چاکەکانو لابردنی ناپەسەندەکان کارێکی سەختە، چونکە لە لایەکەوە کۆمەڵگە بەوە رازی نابێ لە لایەکی تریشەوە هەموکەسێك شیاو نییە بۆ ئەوەی ببێتە کەسێکی (گۆڕەر)، ئەم قەیرانو کێشەیەش نەك هەر لەپرۆسەی پەروەردەدا، بەڵکو لە هەموو جۆرە گۆڕانێکدا روودەدات، کادری شارەزاو خەمخۆرو لێهاتوو یان ژمارەیان کەمە، یان توانای مادیو مەعنەویان لاوازە، بگرە جاری وا هەیە فەلسەفەی گۆڕینەکە زانراو و روون نییە لە لای کادرەکان (گۆڕین، راستکردنەوە، زیادو کەمکردن) سێ پرۆژەی گەورەن لە ناو یەکتریدان، لە کامیانەوە دەست پێ بکرێتو کامیان بایەخی زیاتری پێ بدرێتو کامیان گرنگیو کاریگەری زیاتری هەیەو......هتد، ئەمانە ستافو شارەزاییو هونەری خۆی پێویستە، گۆڕینو چاکسازی لە کلتوردا، کاری پەروەردەیە، بەڵام هاوکاری دامو دەزگاو وەزارەتی تریشی دەوێت.

کاتێك تاکی کۆمەڵگە دەستبەرداری تەواوەتی یان نیمچە تەواوەتی کلتورە رۆشنبیرییە دێرینەکەی دەبێت، کەلەبەرو بۆشاییەك بەدی دەکات لە ژیانیداو پێوەرەکان بە خوارو لاسەنگ دەبینێ، لەبەرئەوە بیر لەوە دەکاتەوە بە شتی تر ئەو کەلەبەرە پڕبکاتەوە، کە زۆرجار پڕکردنەوەکە بە دووبارە هێنانەوەو گێڕانەوەی دراو پەردوی کلتورە رووخاوەکەی پێشووە، دیارە کارەکە لێرەدا وەك ئەوە وایە بە کەرەسەی کۆنی خانوویەکی رووخاو، خانویەکی نوێ دروست بکرێت..!!

زۆرجار لە پرۆسە پەروەردە نوێیەکاندا دیسانەوە ئەو کەسانە دەکرێنەوە بە گۆڕەرو کاربەدەست کە لە پەروەردەی پێشوتردا بوون، هەمان (مامۆستا، هەمان مادەو بابەتو پرۆگرام، هەمان سەرپەرشتیار، هەمان سستەمو ......هتد)، ئەمانە نابنە هۆی گۆڕانێکی جەوهەریو سەرکەوتوانە، بەڵکو تەنها شتێکی رووکەشە، لەیاری میکانۆی منداڵ دەچێ کە هەر بەو کەرەستە میکانۆیانە جۆرەها شت دروست دەکاتو دیسان تێکی دەداتو دروستی دەکاتەوە.

دەبێ پەروەردە لە کاردابێ بۆ گەیاندنو پێدانی زانیاریو شارەزایی نوێ دەربارەی بە کۆمەڵایەتیکردنی تاکەکانی کۆمەڵگە بە شێوازێکی پەروەردەییانەی هاوچەرخ، دەبێت پەروەردە پێشتر تێروپڕ بێ لەو زانیاریانەی کەلەبەری نەبێ، ئەوسا دەتوانێت ببەخشێت، بەڵام زۆربەی پەروەردەی ئێستای ئێمە (فێرکردن)ە، خولێکی درێژخایەنە بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواریو کەمتر رەچاوی ئەوە کراوە کە (پەروەردە) بەڕاستی کار لە سنوری پەروەردەیی خۆیدا بکات، ئەمەش بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی گۆڕانکاری جەوهەریانە لە پرۆسەی هزری پەروەردەدا.

بەڵام لە کۆنگرەی چوارەمی پەروەردەی هەرێمی کوردستان کە لە شاری هەولێر بەسترا، بڕیار لەسەر چەند گۆڕانکارییەکی جەوهەری دران و هەندێکیان دوای یەك ساڵ خرانە بواری جێبەجێکردنی ئەزمونییەوە کە هێشتاو تاکاتی نووسینی ئەم کتێبە دەرەنجامەکان بە تەواوەتی روون نەبوونەتەوە.

هەندێ نەریتو باو لە ناو کۆمەڵگەدا بە ڕادەیەك چەسپیون کە دەکرێت بڵێین پەروەردە ناتوانێت ریشەکێشیان بکات، چونکە ئەوانە بوونەتە بەشێك لە پێکهاتەی هزریو دەروونی ئەو تاکانەی کۆمەڵگە، لەوانەیە مانەوەشیان زیانی بۆ پەروەردە نەبێت، بۆ نموونە: زانایەکی بایەلۆژی هیندی باوەڕی بە پەرستنی مشك هەیە، لە کاتێکدا وەك زانایەکی بایەلۆژی زۆر چاك دەزانێت (مشك) تەنها گیانەوەرێکەو شیاوی پەرستن نییە، هاوکات ئەم کارەی خۆی زۆر بە مەزنو پیرۆز دەزانێ وەك نەریتێکی کلتوریو بۆماوەیی پەیڕەوی دەکات، کە لەوانەیە ئەوە نەبووبێتە کۆسپ لە بەردەم توێژینەوە زانستییەکانی لە بواری لێکۆڵینەوەی نوێی بایەلۆژی دا.

کەواتە مەرج نییە پەروەردە هەموو شتێك بنبڕبکات کە لەگەڵ ژیری ناگونجێ، بەڵکو پەروەردە لە هەوڵی ئەوەدایە کە گۆڕان لە ژیرکارییەکاندا دروست بکاتو بیانکاتە ژیرییەکی پەروەردەییانەی واقیعیانەی پێشکەوتوخوازی ئاسودە بەخش، ناشکرێت هەموو مرۆڤەکانی کۆمەڵگەیەك وەکو یەك بنو وەکو یەکتریش بیر بکەنەوەو هەڵگری هەمان بیروهزرو ئاینو کلتورو رەفتارو گوفتاربن، بەڵکو وەك پێشتر گوتمان پەروەردە پرۆسەیەکی گشتیو گشتگیرەو لە هێڵی خۆیەوە دەڕواتو شتە خراپەکان بژاردەکاتو گوێ ناداتە ئەو شتانەی کە بێ زیانن بۆ کاروپرۆسەی پەروەردەیەکی نایابی نەوەکانی کۆمەڵگەو گرۆی مرۆڤایەتی بە گشتی.

نەك هەر ئەمانە بەڵکو گەلێکجار (پەروەردە) سستەمو نەخشەی گۆڕانکاریو نوێگەری خۆی لە نەریتو یاساو رێساو کەلتوری نەتەوایەتی کۆمەڵگەکەیەوە هەڵدەگوازێتو دەیکاتە سەرچاوەی یەکەمی وەرگرتنی زانیارییەکان بۆ دارشتنی نەخشەی پەروەردەو فەلسەفەی پەروەردەکەی.

زانیاری بەردەوام لە پێشکەوتندایە، کەواتە دەبێ پێ بە پێی ئەویش هزری زانستیانەی تاکەکانی کۆمەڵگەش لە گۆڕانو بەرەو پێشچوندا بن، بۆ ئەم مەبەستە دەبێت پەروەردە سەرچاوەیەك بێت بۆ گەڵاڵە کردنی زانیاری نوێو میکانیزمی تەواویشی دارشتبێ بۆ گەیاندنی ئەو زانیاریانەی بە هزرو بیری تاکەکانی کۆمەڵگە، چونکە ئەگەر بەردەوام زانیارییە نوێیەکان نەهاتنە ناو بیروهزری تاکەکانی کۆمەڵگەوە، ئەوا پەروەردە... پەروەردە...پەروەردە، کەنارگیرو دابڕاو دەبێ لە سەردەمو چاخو کاروانی شارستانێتی گەلان، لە ئاکامدا پەروەردە ستۆك دەبێ، ئاستەکە زۆر نزمتر دەبێت لە ئاستی هۆشیاریو رۆشنبیری واقیعیانەی تاکەکان، لابردنو گۆڕینی زۆر سەختو گران دەبێت، هەروەکو خانوویەك وایە کە بەردەوام خزمەت بکرێو بۆیاخ بکرێتەوە لە کاتی خۆیدا شتە خراپو کەرەستە کۆنەکانی لێ لاببرێ ئەوا هەمیشە وەك تازە وایە ئەگەرچی لە رووی تەمەنەوە کۆنو دێرینیش بێت.

ئەو دەمەی ئاستی پەروەردە نزمتر دەبێت لە ئاستی رۆشنبیری تاکەکانی کۆمەڵگە، ئەوا زۆربەی خەڵکی دەتوانن رەخنە لە پەروەردە بگرنو بە تەعبیری نا پەروەردەییانەش رەخنەکانیان لەجێی نەشیاو کاتی نالەباردا بە دەستەواژەو رستەی رووخێنەرانە دەربڕن.

ئەمەش دەبێتە هۆی دابەزینی بە هاوسەنگی مەعنەویانەی پەروەردە لە ناو جەرگەی زۆربەی جەماوەردا.

پەروەردە سستەمی پەروەردەیی دەبێت لە لایەن زانایانو پەروەردەناسانو فەیلەسوفو رۆشنبیرانی وڵاتەوە دابڕێژرێو زۆرینەی گەل دەنگی بۆ بدات (ئەگەر کۆمەڵگە لە ئاستێکی رۆشنبیریو هۆشیارییەکی باشی پەروەردەیدا بوو)و بە باشترین میکانیزم پەیڕەو بکرێو زۆرترین بودجەی وڵاتی بۆ تەرخانبکرێو کەمترین خەرجیشی تێبچێ لە کاتی شیاوی خۆیدا، دەبێت پەروەردە پێشەنگو رچەشکێنی جەماوەر بێتو ئەوان پاشکۆو شوێنکەوتەو بەرگریکارو خەمخۆری بن.

سەرچاوە: هزری پەروەردەییو فەلسەفەکەی.



# بۆچی گەنجان نهێنییەکانیان لای دایکو باوکیان نادرکێنن؟

ئا: بێگەرد هەورامی

دیاریو بەخششەکانی خوای گەورە لە ژیاندا بۆ بەندەکانی زۆرن لە بەنرخترینو باشترینی ئەو دیارییانە بەخشینی منداڵو نەوەیە بە دایکانو باوکان، دایکانو باوکانیش بۆ ئەوەی بەئەمەك بن بەرامبەر ئەو دیارییە بەنرخە پێویستە هەستن بە پێگەیاندنو پەروەردەکردنی ئەو منداڵە بەجوانترین شێوازو باشترین ڕێگە، تا نەوەکانیان لە سایەی سۆزو بەزەییو میهرەبانیاندا بحەوێنەوە، پێگەیاندن بەمانای گەورە کردن یان دابینکردنی پێداویستی نییە بۆیان، بەڵکو پەروەردەیەك کە ڕێخۆشکەر بێت لە بەرنامە ڕێژکردنێکی دروست بۆ پێکهێنانی داهاتوویەکی دروستو لێوان لێو لە ئامانجو هاوکار لە هاتنەدی ئەو ئامانجانە، هەروەها دروستکردنی پردێك کە ببێتە ڕێڕەوێك بۆ بە دەستهێنانی متمانەو خۆشەویستیو هاوڕێیەتییان...

بەداخەوە هەندێکجار ئەو پردە دەڕمێتو بۆشاییەکی فراوان دروست دەبێت لە نێوانیاندا، ئەمەش دەبێتە مایەی ئازار بۆ هەردوولا لە داهاتوودا.

بۆ زیاتر ئاشنا بون ڕوودەکەینە هەندێك لە باوانو شارەزایانو هۆکاری دروستبوونی بۆشایی نێوانیان دەپرسین، دروستبوونی ئەم پرسیارەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە دەبینین کوڕانو کچان سەرەڕای شاردنەوەی نهێنییەکانیان لە باوانیان لەگەڵ ئەوەشدا پەنا بۆ هاوڕێیانو هاوتەمەنانی خۆیان دەبەن، کە ئەگەری ئەوەی هەیە بەرەو هەڵدێریان بەرن نەك یارمەتیدانو هاوکاری کردنیان! بۆیە دەپرسین ئایا هۆکاری هەڵهاتن لە لایەن کوڕانو کچانەوە بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکانیان چییە؟

یان ڕوونتر بڵێین: دروست بوونی ئەو بۆشاییەی نێوان باوانو منداڵەکانیان هۆکارەکەی بۆ کێ دەگەڕێتەوە؟ بۆ ئەم مەبەستەش چاوپێکەوتنمان لەگەڵ چەند کەسێك ئەنجامداوە، بەم شێوەیە هاتنە وەڵام:

توانا خەسرەو توێژەری کۆمەڵایەتی: یەکێك لە هۆکارەکانی شاردنەوەی کاروبارەکانی گەنج لە ماڵەوەیان دەگەڕێتەوە بۆ بێ متمانەیی گەنج بەدایکو باوکی لەو ڕووەوە، کە نەیان توانیوە هەر لە منداڵییەوە بەشەفافیو کراوەیی باسی کێشەکان لەگەڵ منداڵدا بکەنو زۆربەی جار پرسیارەکانی منداڵ یاخود گەنج بەبێ وەڵام ماوەتەوە واتە باوان نەیان توانیوە ببنە جێ متمانەی منداڵەکانیان، لە لایەکی ترەوە نەبوونی گفتوگۆو وروژاندنی پرسیار لەلای منداڵ وادەکات کە هەمیشە شەرم بکات لە گوتنی کێشەوپێداویستییەکانی لە لای ماڵەوە، واتە غیابی گفتوگۆو داواکردنی مافو دەرخستنی کێشەی گەنج لە ماڵەوە نەبووەتە نەریتی ڕۆژانە تا گەنج نەترسێتو ئەوەی لە دڵیدایە بیڵێت، خۆ هەندێجار ئەگەر لە منداڵیشدا پرسیارێکی غەریبی کردبێت یاخود باسی مەسەلەیەکی تارادەیەك داپۆشراوی کردبێت ئەوا ڕاستەوخۆ بەبێ شەرم وەسف کراوەو لەبەرچاوی ئەندامانی خێزان سەرزەنشت کراوە.

بەڵام زۆربەی کات گەنج ئەم دەروازەیەی لەلای هاوڕێکانی شك بردووەو بوێرانە ئەو باسو بابەتانەی کە بەلایەوە گرنگە باس کردووە، چونکە هاوڕێکانی هەمان کێشەیان هەیەو پرسیارەکە نابێتە شتێکی نامۆ، لە هەمان کاتدا ئاستەنگەکانی بەردەم گەنج لە ڕووی پرسیارکردنەوە لە بەرامبەر هاوڕێکانیدا کەمترە یاخود هەر نییە.

هیمداد کاڵ ژمێریار: سەرەتا زۆر سوپاست دەکەم بۆ هەڵبژاردنی ئەم بابەتە هەستیارە، بێگومان هەموو باوکێك حەزدەکات نەوەکەی لەخۆی پاکترو چاکتر بێت، بەڵام نەبوونی میکانیزمێکی کارا لەپەروەردەکردندا هۆکارە بۆ سەرهەڵدانی ئەم دیاردەیە، گرنکترین هۆکاری دروستبوونی ئەم حاڵەتەش نەبوونی زمانی گفتوگۆیەکی ڕاست و دروستە لە نێوانیاندا، کە ئەمە هۆیە بۆ دروست نەبونی خۆشەویستیو ڕێزگرتنو لێك تێگەیشتنو لێك نزیکبوونەوە، هەروەها بوونی دوو ئاڕاستەی جیاواز لە نێوان دایك و باوکەوە بەرامبەر کوڕانو کچانیان بە واتایەکی تر نەبوونی هاوڕایی لە نێوان دایك و باوك بۆ ئاڕاستەکردنی نەوەکانیان، هەروەها سەرزەنشت کردنی باوك بۆ نەوەکەی بە هەندێك وشە کە وادەکات بێ ئومێد بێت لەژیان، نەوەك لە دایك و باوك، بۆ نموونە پێی دەڵێت: تۆ دوا ڕۆژت گەش دیار نییەو لە ژیان دواکەوتووی، خۆت پێ بەڕێوە ناچێتو مرۆڤێکی بێ سوودیت..هتد، وادەکات ئەم جۆرە ڕەفتارانە بەربەستێك دروست بکات لەنێوانیاندا ئیتر لە ناخەوە دەڕوخێت و جارێکی تر بیر لەوە ناکاتەوە کە باوانی بەکەڵکی ئەوە بێت بو ڕێنمونی کردنی ئەو، من بە پلەی یەك دایك و باوك بە بەرپرس دەزانم لە ئاست دروستبوونی ئەم دیاردەیە.

شوکریە یاسین، فەرمانبەر: من وەك دایکێك هۆکارەکە بۆ دایکو باوك دەگەڕێنمەوە، لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی باش هەڵسوکەوت ناکەن لەگەڵ منداڵەکانیاندا وەك هاوڕێ نین، بۆیە بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کە باوان بوونەتە هۆی دروستبوونی لەدەرەوە پڕی دەکاتەوە، پێم باشە بە تایبەتی دایك هاوڕێیانە مامەڵە بکات لەگەڵ منداڵەکانی، بۆ ئەوەی ترسێك دروست نەبێت لە دڵیدا، کە نەتوانێ کێشەکانی باس بکاتو ئەو نهێنییەی هەراسانی کردووە بیدرکێنێ.

حسین کریم ابراهیم کاسب: من وەکو باوك کوڕو کچی گەورەم هەیە بە یەك چاو سەیری هەردوو ڕەگەز دەکەم، هەموو ئامۆژگاریم ئەوە بووە بۆیان وتومە هیچ شتێکم لێ مەشارنەوە ئەگەر هەڵەشتان کردبێت، لەبەرئەوەی کە

لە تۆڵە ناترسن راستیم پێ دەڵێن، چونکە منداڵ دایکو باوکی خۆش بوێ باشترە لەوەی لێیان بترسێت، چونکە ئەگەر بترسێت زۆر هەڵە دەشارێتەوە تا هەڵەکان گەورەتر دەبنو چارەسەرەکەشی گرانتر دەبێت، کەواتە هۆکاری سەرەکی هەڵهاتنی گەنجان لەماڵو پەنابردنیان بۆ هاوتەمەنانی خۆیان دایکو باوکە.

دڵسۆز سەعید محمد مامۆستا: بەلای منەوە بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە:

یەکەم: نەزانینی پەروەردەیەکی دروستو گوێ بۆ نەگرتنی هەر لەمناڵییەوە بۆیە پەنا دەباتە بەر کەسێك گوێی بۆ بگرێت.

دووەم: ئەومنداڵانەی دایکو باوکیان کارێك دەکەن کەمترین کات لەگەڵ مناڵەکانیان بەسەر دەبەن، کاتێکیش دەگەڕێنەوە ماڵەوە بەهۆی کاروباری ماڵو خۆ سەرقاڵ کردنی زیاد لە پێویستو تەرخان نەکردنی کاتێکی تایبەت بە منداڵەکانیان، بۆیە زیاتر پەنادەبەنە بەر هاوڕێکانیان لە دەرەوە.

تەلار فارس یاریدەدەری پزیشکی: من وەك دایکێك دەستخۆشیتان لێ دەکەم بۆ دەرخستنی ئەم دیاردەیەو گەڕان بەدوای هۆکارو دۆزینەوەی چارەسەر بۆ ئەم دیاردە زۆر بەرچاوەی کە لە ئێستادا زۆر بەدی دەکرێت، لە راستیدا هۆکاری سەرەکی بۆ دایکو باوك دەگەڕێنمەوە، چونکە ئەوان بەرپرسن لەپەروەردەو ئاراستەکردنی نەوەکانیان، دایکو باوك دەتوانن متمانەی هاوڕێیەتیو دڵسۆزترینو نزیکترینی کەسەکان کە خودی خۆیانن ببەخشنە منداڵەکانیان، هەر لەسەرەتاوە لەگەڵیان بنو لێیان بپرسنەوە بەشێوەیەك لەکاتی باسکردنی هەر شتێك کە بۆنی هەڵەی لێ دێت دوور بکەونەوە لە خۆ توڕەکردن یان هەڕەشەکردنو لێدان بە حسابی ئەوەی ئامۆژگاری دەکرێت، ئەمە زۆر هەڵەیە بۆیە ناچار دەبێت لە شوێنێك یان لای کەسێك خولیاو نهێنی یان کێشەکانی باس بکات کە گوێی لێ بگرێت نەك ئیهانەی بکات، ئەو بە منداڵی نەیکاتە هاوڕێی خۆی لە کاتی پێگەیشتنو گەورە بونیشدا ناوێرێتو دەترسێت، بۆیە بەدوای ئارامگەیەکی تردا دەگەڕێ کە لە ماڵ و خێزانەکەی خۆی دا بوونی نییە.

کەوسەر محەمەد خوێندکاری زانکۆ: هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێنمەوە کە لەیەکگەیشتنێکی پتەوو تۆکمە لەنێوان دایك و باوك بەرامبەر بە رۆڵەکانیان نەبووەو لە سەرەتاشدا کە مناڵەکەیان بچووك بووە گرنگییەکی ئەوتۆیان پێنەداوەو پەراوێز خراوەو پشتگوێ خراوە.. سەرهەڵدانی هەموو ئەو بۆشاییانە دەگەڕێنمەوە بۆ دایکو باوك بە تایبەتی دایك کەرۆژانە لە ماڵەوە چاودێری مناڵەکانی دەکات، بەپێی پێویست نەیتوانیوە گرنگی بە رۆڵەکانی بداتو گۆشیان بکاتو پێیان بڵێت بەم شێوەیە رەفتار بکەنو بەو شێوەیەش لەگەڵ دەوروبەر مامەڵەو هەڵسوکەوت بکەن، سروشتی کۆمەڵگەی ئێمەش وایە کە لەم رۆژگارەدا دایکو باوك ئەوەندە سەرقاڵن، سەرقاڵیەکەیان وایلێکردوون کە ماندووبنو نەتوانن گرنگی بەمناڵەکانیان بدەن، سەرباری هەموو ئەوانەش زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵگە ناهۆشیارو نارۆشنبیرنو نەیانتوانیوە برەو بەرۆشنبیرییەکەیان بدەن، تاوەکو بەو هۆیەوە بتوانن رێگری لەو بۆشاییەدا بکەن کە دووچاری خانەوادەو منداڵەکانیان دەبێتەوە، راکردنی کچ و کوڕیش بۆ پڕکردنەوەی ئەم جۆرە بۆشاییانە هۆکارەکەی بۆ فەرامۆشی دایکو باوك دەگەڕێنمەوە کە بوونەتە هۆکارێك بۆ ماندووکردنی بیرو هزری رۆڵەکانیان.. بۆیە چاکترین چارەسەر ئەوەیە هەر خانەوادەو لە ئاستی خۆیەوە بتوانێت بەخۆیدابچێتەوەو هەوڵو تەقەللا بدات لەپێناو رێگری کردن لەنێوان خۆیو منداڵەکانی ئەوسا دەبێت بە خانەوادەیەکی تۆکمەو سەرکەوتوو و زاڵ بوو بەسەر پەرتەوازەیی منداڵەکانی کە ئەمڕۆ کۆمەڵگەی کوردەواری بەداخەوە خەریکە وەکو ئەوروپای لێبێت لەدرزکەوتنو بۆشایی تێکەوتن لەنێو خێزان.

چنار نامق نوسەرو رۆشنبیر: هەڵبەتە پەروەردەکردنی منداڵ کارێکی هێندە ساناو ساکار نییە بە چەشنێك دایکانو باوکان تێیدا سەرکوتووبن، لێرەدا مەبەستمە باس لەپەروەردەی دروست بکەم، تاکو ئێستا لە وڵاتی ئێمەدا دەزگایەك نییە دایکو باوك فێر بکات چۆن منداڵ پەروەردە بکەنو چۆن رەفتار لەگەڵ منداڵدا بکەن، بۆیە هەریەك لە ئێمە بەو شێوەیەی خۆی بە باشی دەزانێ منداڵەکەی پەروەردە دەکات، رەنگە هەندێجار منداڵێکی تەندرووست دەربچێو زۆر جاریش بە پێچەوانەوە، هەڵبەتە هەر خێزانێك بەپێی رادەی رۆشنبیری خۆی مامەڵە لەتەك منداڵدا دەکات، دیسانەوە ئەمەش فاکتەری سەرەکی نییە بۆ پەروەردەکردن، چونکە ناخی منداڵ جیهانێکەو پێویستی بەوەیە لێی تێبگەیت، پەروەردەی دروست ئەوەیە مرۆڤ بزانێت هاوسەنگی دروست بکات لە مامەڵە کردن لەگەڵ جگەرگۆشەکەی، لە هەندێ خێزان خۆشەویستی لەرادە بەدەرو نازدارکردنی منداڵ دەبێتە هۆی ونبوونی کەسایەتی تاك، ئەمەش لە دوارۆژدا بەسەر تاکدا رەنگ دەداتەوەو دەیکات بە کەسایەتییەکی لاوازو بێهێز کە نەتوانێ بەرەنگاری ببێتەوە، چونکە چارەنووسی مرۆڤ بە تەنها رەگەزە مادییەکان نییە دایەوبابە بۆی دەستەبەر بکات، بەڵکو شتگەلێك رووبەڕووی تاك دەبێتەوە بەبێ ویستی ئەوان روو دەدات جا چۆن کەسێك بتوانێ رووبەڕووی بێتەوە لە تەمەنی گەنجیشدا هەر خۆی بە منداڵ دەزانێو هێندە بە ناز گۆشکراوە، بێگومان لە بەرچاوی دایەوبابە مەحاڵە گەورە ببێ، لێرە ناز نەخۆشییەکی کوشندەیە منداڵ تووشی پەتای لاوازی دەکات. لە یادمە تەمەنم (٢٠) ساڵان بوو زۆرجار دایکم و باوکم بانگیان دەکردم (بەبەکە).

لە لایەکی دیکەوە هەندێك خێزان منداڵەکانیان بە توندوتیژی پەروەردە دەکەن، هەر بۆیە ئەم جۆرە پەروەردەکردنەش کاریگەری نێگەتیڤی دەبێت بەسەر منداڵەکەو دەبێتە کەسایەتییەك متمانەی بەخۆی نابێت، ئەم فاکتەرەش دەبێتە هۆی خۆ بەکەم زانین لەنێو کۆمەڵدا.

منداڵ لەسەرەتای تەمەنیدا پێویستە فێری راستگۆیی بکرێت لەلایەن باوانەوە، راستگۆیی بەو واتایەی کە سڵ لە دایکو باوك نەکاتەوەو وابزانێت گەر هەڵەیەکی ئەنجامدا ئیدی مەحکوم دەکرێو بە توندوتیژی وەڵام دەدرێتەوە، راستگۆیی بەو مانایەی بە هۆی ترس لە سزادان شتگەلێك لە باوان نەشارێتەوە، جا ئەمە لە بچووکترین شتەوە دەست پێدەکات تا گەورەترین شت، بۆنموونە کاتێك منداڵ پەرداخێك دەشکێنێ پێویست ناکا لەترسی سزا کردەوەکە پەردەپۆش بکاتو نەوێرێت بیدرکێنێ، هەر لێرەوە لە ئەستۆی باوانیدایە متمانە لەگەڵ منداڵەکەی دروست بکات، ئەو متمانەیە لەگەڵی گەورە دەبێت، منداڵ کە فێری گوتنی راستی بوو ئیدی بۆشایی نامێنێ لە نێوان ئەو و باوانیدا بۆ هەر پرسێك بێت پە نا دەباتە بەر ئەوان بەر لەوەی پەنا بباتە بەر هاوڕێکانی.

مەلا عومەر بەریتانیا: دەکرێت چواردەورو جۆری کارو خوێندنی منداڵو تێکەڵی بە دەوروبەر هۆکارێکی بەهێزبن بۆ ترازانی ئەو پردە، بەڵام بە بڕوای من هۆکاری زۆر سەرەکی باوان خۆیانن بۆ درز کردنە نێو ئەو پردە تا دەگاتە ئەو رادەی تەواو لێك دەترازێ و تەنها پەیوەندی باوان بە منداڵەکانیانەوە لایەنی مادی دەبێتو منداڵەکانیان بەردەوام پەنا بۆ کەسانی دەرەوە دەبەن بۆ تێرکردنی ئەو بۆشاییەی پڕنەکراوەتەوە لە لایەن باوانیانەوە، ئەمەش دەبێت باوان هەر لە سەرەتاوە بەرنامە رێژی بۆ بکەنو لەگەڵ منداڵەکانیاندا گەورە ببن نەك ئەو حیوارە منداڵیانە گۆڕانی بەسەردا نەیەت، کاتێك منداڵ دەبینێ گەورە بووە دەبێت مامەڵەی باوان لە ئاستی خۆیاندا بن نەك هەر گڕوگاڵیان بۆ بکەن! منداڵ بە پاکی لە دایك دەبێت وەك لە فەرموودەیەکدا هاتووە [ کل مولود یولد علی الفطرە، فأبواه یهودانه أو ینصرانه أو یمجسانه] جگە لەو فیترەتە پاکە هیچی تری تێدا نییە، هەر لە منداڵیشەوە لەبەر دەستی باواندایە جا ئەگەر ئەوان بەشتی باشو شیاو لە جێگەی خۆیدا پڕ نەکەنەوە منداڵەکان هەوڵی پڕکردنەوەی لە دەرەوەی ئەوان دەدەنو ئیتر لێك ترازانەکە دروست دەبێتو لە دەستی باوان دەردەچن.

# بڕیارم دا هەشت درۆ شیرینەکەی دایکم لە یاد نەکەم!

و:عوسمان سەنگاوی

بەسەرهاتەکەم لە کاتی لەدایکبونمەوە دەست پێدەکات، من تاقانەی دایکو باوکم بووم، بەڵام حاڵو گوزەرانێکی زۆر دژوارمان هەبوو تەنانەت زۆرجاران خواردنەکەشمان بەشی نەدەکردین، بیرم دێت رۆژێك هەندێك برنجمان هەبوو دایکم کردی بە چێشت تاوەکو ژەمێکی پێ بەرێ بکەین، ئاگام لێبوو دایکم بەشە برنجەکەی خۆیشی کردە قاپەکەی منەوەو پێی گوتم: کوڕی خۆم تۆ تێر بخۆ، چونکە من برسیم نی یە! ئەوە یەکەمین درۆی شیرینی دایکم بوو.

کاتێك هەندێك گەورە بووم بیرم دێت دوای ئەوەی دایکم کاری ماڵەوەی تەواو دەکرد، دەچووە رووبارەکەی نزیك ماڵەوەمان بۆ راوە ماسی، چونکە حەزی دەکرد من ماسی بخۆم بۆ ئەوەی زوو گەورە ببم، رۆژێك بەخت یاوەری دایکم بوو دوو ماسی راو کردو لە قاپێکدا بۆی سوورکردمەوەو لە بەردەمی مندا دایناا، منیش دەستم کردە خواردنی، چاوم لێبوو دایکم ئەو کەمە گۆشتانەی کە بە ئێسقانی ماسییەکەوە مابووەوە لەبەرماوەکەی من دەیخوارد، منیش دڵم ئازاری پێگەیشتو ماسییەکەی ترم خستە بەردەمی دایکم تا بیخوات، کەچی ئەو وتی: کوڕی خۆم تۆ بیخۆ ئەی نازانیت من حەز بە گۆشتی ماسی ناکەم! ئەوەش دووەم درۆی شیرینی دایکم بوو.

تەمەنم گەشتە ئەوەی بچمە قوتابخانە، بەڵام ئەوەندە پارەمان نەبوو پێداویستییەکانی قوتابخانە بکرم، هەر بۆیە دایکم دەستی گرتمو بردمی بۆ یەکێك لە فرۆشگەکان تا جلوبەرگم بۆ بکرێت بە قەرز، لە بەرامبەردا دوکاندارەکە داوای لەدایکم کرد ماوەیەك حەماڵی بۆ بکاتو دایکیشم رازی بوو، شەوێك دایکم تا درەنگانێك نەهاتەوە منیش چوومە دەرەوە تەماشام کرد دایکم زۆر هیلاکەو خەریکی حەماڵییە، وتم دایکە گیان بۆ ناگەڕێیتەوەو زۆر هیلاك دیاریتو دەرەوەش زۆر ساردە، کەچی دایکم بەزەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دامەوەو وتی: کوڕی خۆم من هیچ هیلاك نیم! ئەوەش سێیەم درۆی شیرینی دایکم بوو.

لە کۆتایی ساڵدا کە تاقیکردنەوەی قوتابخانەکان دەستی پێکرد، دایکم رۆژێك لەگەڵمدا هات بۆ قوتابخانەکەمان، بەڵام لەدەرەوەی قوتابخانەکە لەبەر ئەو خۆرە گەرمە چاوەڕوانی منی دەکرد تا لە تاقیکردنەوەکەم تەواو بووەو هاتمە دەرەوە، دایکم باوەشی پێدا کردمو دوعای سەرکەوتنی بۆ کردمو پەرداخێك شەربەتی ساردیشی بەدەستەوە بوو پێشکەشی کردم، منیش لەبەر تینوێتی خۆم زۆربەیم خوارد، تەماشام کرد دایکم لەبەر گەرما ئارەق بەنێو چاوانیدا دێتە خوارەوە، منیش ئەو کەمە شەربەتە ساردەی کە مابوو لە پەرداخەکەدا بۆ دایکم راگرت تا ئەویش هەندێك بخواتەوە، کەچی دایکم وتی کوڕم تۆ بیخۆ من تینووم نییە! ئەوەش چوارەم درۆی شیرینی دایکم بوو.

دوای ئەوەی باوك کۆچی دوایی کرد، ئیتر دایکم وەکو بێوەژنێك ئەرکەکانی زیاتری کردو زیاتر هەستمان بە برسێتی دەکرد، بۆیە دەبوو دایکم کار زیاتر بکات، تاوەکو من بێ باوکیم پێوە دیار نەبێت، هەرچەندە ماڵی مامم نزیکمان بوو، ئەویش پیاوێکی زۆر باش بوو، هاوکاری باشی دەکردین بەڵام کاتێك خەڵکانێك گوزەرانی ئێمەیان بینی بەو جۆرە داوایان لە دایکم کرد کە شوو بکاتەوە تاوەکو لەو بارە خراپە رزگاری بێت، کەچی دایکم بەوە وەڵامی دانەوە کە من (واتە دایکم) پێویستی بە کەس نییە! ئەوەش پێنجەم درۆی شیرینی دایکم بوو.

من قۆناغەکانی قوتابخانە سەرەتاییو ناوەندیو ئامادەییو زانکۆم تەواو کردوو لە کارێك دامەزرام کە دەمتوانی هەندێك پارەش پاشەکەوت بکەم، بیرم کردەوە کە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە دایکم پشوو بداتو من ئەرکی ماڵەوە بگرمە ئەستۆم، چونکە هەستم دەکرد دایکم تەندروستیشی باش نییە، لەو کاتانەدا دایکم سەر لە بەیانیان دەچووە بازاڕو راخەرێکی رادەخستو سەوزەی دەفرۆشت تا درەنگانێك، منیش وتم دایکە گیان من هێندە پارەم هەیە کە بەشمان بکات پێویستە تۆ پشوو بدەیت، بەڵام دایکم وتی: کوڕی خۆم تۆ پارە بۆ خۆت پاشەکەوت بکە من پارەم بەشی خۆم هەیە! ئەوە شەشەم درۆی شیرینی دایکم بوو.

پاش ماوەیەك ماستەرم وەرگرتو کاری باشترم دەست کەوت، یەکێك لە کۆمپانیاکان لە وڵاتی ئەڵمان بانگهێشتی کردم تالەوێ کار بکەم، منیش زۆرم پێخۆش بوو، سەفەرم کردو لەوێ نیشتەجێبووم، دواتر داوام لە دایکم کرد کە ئەویش بگاتە لام لە ئەڵمانیاو لەنزیکی خۆم بێت، بەڵام هەستم کرد دایکم حەزناکات من سەرقاڵ بکات بەخۆیەوە، بۆیە وەڵامی بۆ ناردم کە کوڕی خۆم حەز بە ژیانی تاراوگە ناکەم! ئەوەش حەوتەم درۆی شیرینی دایکم بوو!

دایکم چووە تەمەنەوەو پیربوو، دواتر بەو پیرییەوە دووچاری نەخۆشی شێر پەنجەی چاو هات، دەبوو یەکێك خزمەتی بکات، بەڵام چەند وڵاتێك کەوتبووە نێوان منو دایکمەوە، بۆیە بڕیارم دا هەموو کارەکانم بەجێبهێڵم بگەڕێمەوە بۆلای دایکم، کاتێك دایکمم بینی لەسەر جێگا کەوتبوو حاڵی زۆر خراپ بوو هەر لەدایکەکەی جاران نەدەچوو، من زۆر ئازارم پێگەشت بەو حاڵەی دایکمو فرمێسك لە چاوەکانم داباری، کەچی دایکم هەوڵی دا بزەیەك بەڕوومدا بدات، بەڵام لەبەر ئازار نەیتوانی، کاتێك دایکم فرمێسکەکانی منی بینی وتی کوڕی خۆم مەگری من هەست ئازار ناکەم!! ئەوەش هەشتەم درۆی شیرینی دایکم بوو!

دوای ئەوە دایکم چاوەکانی لێك نا، ئیتر چاوەکانی نەکردەوە بۆ هەتا هەتایە!

تۆش ئەگەر دایکت ماوە بزانە نیعمەتێکی زۆر گەورەت هەیەو ئەو کەسەی کەناوی دایکە زۆر لەگەڵتدا ماندوو بووەو هەمیشە نزای سۆزو بەزەیی خوای بۆ بکە..

رۆژێك لە رۆژان پیاوێك بۆ ماوەی چەند کاژێرێك بەوردی چاودێری پەپولەیەکی بچووکی کرد، کە دەیویست لە قۆزاخەکەی بێتە دەرەوە، زۆر هەوڵی دەداو تێدەکۆشا هەتا بتوانێ لە کونێکی بچوکی قۆزاخەکەی خۆی دەرباز بکاتو بێتە قۆناغێکی تری نوێی ژیانی... لە ناکاودا لە جوڵە کەوتو وەستا، وەك بڵێی توانای نییە بەردەوام بێت لە هەوڵەکانی بۆ برینی قۆناغێك لە قۆناغەکان، پیاوەکە وا گومانی برد کە پەپوولەکە هەموو توانای خۆی بەکارهێناوەو ناتوانێ هەستێ بەو کارە، پاشان پەپوولەکە بە تەواوی وەستا لە هەوڵدان، بۆیە پیاوەکە هەستو سۆزی بۆی جوڵاو بەزەیی پێدا هاتەوە، هەستا بە برینی قۆزاخەی پەپولەکە بە مەقەستێکی بچووك وەك یارمەتیدانێك بۆ پەپولە بچکۆلەکە!

لەو کاتەدا پەپولەکە زۆر بە ئاسانی کەوتە خوارەوەو لە قۆزاخەکەی هاتە دەرەوە، بەڵام بە لە شێکی لاوازو بێ هێزو باڵەکانی سستو نەکراوە بوون.

پیاوەکە بەردەوام چاودێری دەکرد پێی وابوو کە باڵەکانی دەکرێنەوەو گەورە دەبنو لەشی لاوازی بەهێز دەبێتو پاشان دەتوانێ بفرێت.

بەڵام هیچ لەوانە رووی نەدا، پەپوولەکە بە درێژایی ژیانی بە لاوازیو بێ هێزیو باڵە سستو بێ تواناکانی کە نەیدەتوانی بفرێت مایەوەو ژینی بەسەربرد.

سۆزو بەزەیی پیاوەکە بۆ پەپوولەکە چیکرد؟ چ کاریگەرییەکی هەبوو لەسەری؟

ئەو نەیدەزانی توانای خوای گەورەو سۆزو بەزەیی بۆ پەپولەکە لەوەدا بوو کە ئەو پەپولەیە چاوەڕێی بکاتو ئارام بگرێتو بە هەوڵی خۆی ئەو قۆزاخەیە بدڕێتو بێتە دەرەوە، چونکە لەو ماوەیەدا شلەیەکی تایبەت دەگاتە باڵەکانیو بەهێزیان دەکاتو پاش هاتنەدەرەوەی یارمەتی فرینی دەدات!!

لەم بەسەرهاتەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە لە ژیانماندا هەندێجار پێویست دەکات لە دژی سەختیو دژوارییەکانی ژیان بجەنگێینو لەسەنگەری رووبەڕووبوونەوەدا بینو ئەو رێگرو ناخۆشییانە بکەینە هۆکارێك بۆ زیاتر پێشەوە چوونو سەرکەوتن نەك دەسەوسانو خۆدان بەدەستەوە، تا بتوانین قۆناغەکانی ژیان بە سەرکەوتوویی ببڕینو ئاسوودەو بەختەوەر بین.

ئەگەر خوای گەورە هەموو دەمێك ژیانێکی بێ کێشەو ئارامو بێ گیروگرفتو ئاسانی پێبەخشین، ئەوا بە دەستەوسانی دەمێنینەوەو ناتوانین بەرەنگاری نەهامەتیو ناخۆشییەکانی ژیان ببینەوە... هەروەك چۆن پەپولەکە نەیتوانی بگاتە مەبەستی خۆیو بفرێت..!!

داوای هێزم کرد... خوای گەورە نەهامەتی پێبەخشیم تا بەهێزتر بم.

داوای ژیریم کرد... خوای گەورە کێشەی پێبەخشیم تا بتوانم چارەسەریان بکەم.

داوای سەرکەوتنم کرد... خوای گەورە عەقڵو لاشەیەکی پێبەخشیم تا کار بکەم.

داوای ئازایەتیم کرد... خوای گەورە سەختیو دژواریو رێگرییەکانی ژیانی پێبەخشیم تا بەرەنگاریان بووەستم.

داوای خۆشەویستیم کرد... خوای گەورە کەسانێکی بێ تواناو ماندووو شەکەتی لە مامەڵەدا پێبەخشیم هەتا بتوانم بەخۆشەویستییەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکەم.

داوای سۆزو ستایشم کرد... خوای گەورە چەندین هەلی جیاوازی پێبەخشیم تا بە هۆیانەوە کاربکەم.

نەگەیشتم بە هیچ لەوانەی کە داوام کردن!!!

بەڵام بێگومان خوای گەورە ئەوەی پێویستم بوو پێی بەخشیم.!!

کەواتە لە ژیاندا بەبێ ترس بژی... بەرەنگاری ناخۆشیو ناڕەحەتییەکان ببەوە، توانای خۆت بسەلمێنە بۆ خۆتو کەسانی تریش کە دەتوانی ئەو هەنگاوانەی دەتگەیەننە شوێنی مەبەست ئازایانە دەیبڕیت.

ئارامت هەبێت، زانابە لەو کارەی پێی هەڵدەسیت، کارێك بکە شارەزاییت لێی هەبێت، لە هەمووی گرنگتر:

ئەوەی بۆ خودی خۆت پێت خۆشە بۆ براکەشت پێت خۆش بێت...

پێت خۆش بێت لە بەهەشتی دونیادا بژی، لە ئاگری دونیا دووری بخەرەوە، دوعای سەرکەوتنی بۆ بکە، نەرمو نیان بە لە مامەڵە کردن لەگەڵی، خۆشت بوێ.

کەهەڵەی کرد چاوپۆشی لێ بکەو لێی ببوورە.... نهێنی بپارێزە... ئاسوودە دەبێت.






# چۆن دەبیتە هاوسەرێکی نموونەیی؟

بۆ ژنان

چەنـــد ئامۆژگارییەك كە پیاوانی خاوەن ئەزموون پێشكەشتی دەكەن.

بۆ دواجار پیاوان لە پێداویستیەكانیان دەدوێن، كۆكردنەوەو ئامادەكردنی:

(جی. ئیس. سۆڵت.).

ئەمـــە دەســـت پێشـــخەری منـــە، ئەگەر بەدڵت نییـــە، چەند بنەمایەكـــی ترم هەیە رازیت دەكەن. (جروتشۆ ماركس).

* بۆچی پیاوان هەستەكانیان دەرنابڕنو نایان دركێنن؟

لەبەرئەوەی پیاون!

لە راســـتیدا ئەم كتێبە ماوەی دوو ساڵی خایاند لە زۆر كـــردنو پاڕانەوە لە زیاتر لە هەزار پیاو، بۆ وتنی پێداویســـتیو دەربڕینو دركاندنی هەستەكانیان.

تـــكات لێ دەكـــەم چ پێویســـتییەكەت لە هاوسەرەكەت دەوێت بیدركێنە، ئەوە ئامانجی ئەم بابەتەیە.

تـــا ئافرەتـــان بزانـــن پیـــاوان حەزیـــان لەچییەو شەیدای چین؟

لە رێی ئـــەم ئامۆژگارییانەوە پیاوان بە هاوســـەرەكانیان دەڵێن تەماشا، ئەمە ئەوەیە كە ئێمە پێویســـتمانە، بـــە تەواوی وەكو ئەو پیاوەی لە لاپەڕە... پێت دەڵێت: ... .

من بە دڵنیاییەوە جەخت لەســـەر ئەوە دەكەمەوە كە ئەم بابەتەی لەبەر دەستتدایە هۆكارێكـــی یارمەتی دەرە، رێرەوێكی باشـــە بۆ گفتوگۆو لێك تێگەیشـــتن، دەبینیت چۆن دەستی تۆو هاوسەرت دەگرێت بەرەو قوڵایی تێگەیشتنو هاوسەرگیرییەكی سەركەوتوو.

هـــاوكات ئەم بابەتە رێبـــەرەو نامیلكەی هاوڕێ ( چۆن دەبیتە هاوسەرێكی نمونەیی؟)، چەند ئامۆژگاییەك پیاوانی خاوەن شارەزایی و بـــە ئەزمون پێشكەشـــی دەكـــەن. بۆ ئەو كەسانەش زۆر گرنگە كە نزیكن لە پەیوەندی هاوسەرگیری.

ئـــەم بابەتـــە گرنگـــە لەهەمـــان كاتـــدا زۆر شـــتی گرنگ دەخاتە ســـەر مەڵۆی هەر پەیوەندییەكـــی هاوســـەری یاخـــود بـــۆ ئەو كەســـانەی كە دەیانەوێت بچنە نێو كەژاوەی ژینـــی هاوســـەرێتییەوە. زۆر هۆكاری گرنگی سەركەوتنی پێشـــكەش بە ژینی هاوسەرێتی من كرد، (هەرچەندە ئەو هاوسەرگیرییە هەر لـــە ســـەرەتاوە زۆر نایابـو نـــاوازە بوو پێش دەرچوونی ئەم نامیلكانە).

متمانـــەم پـــێ بكـــە! متمانەم پـــێ بكە! متمانەم پێ بكە!

ئالان (٢٩) ســـاڵ/ تەنهـــا یەك رۆژە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرگیرییەوە.

ســـووربە لەســـەر هانـــدانو پاڵنانم بەرەو پێشەوە، پێویستە باوەڕت هەبێت ئەو بەهرەیەم هەیە كـــە دەتوانم بە هۆیـــەوە خەونەكانمان بهێنمە دی، هەرچەند ئەگەر ماوەیەكی زۆرتر لەوەی كە بۆچوونم وابوو بۆی.

ئید (٤٧) ســـاڵ/ (٢٥) ســـاڵە هاوسەرگیری ئەنجامداوە.

بمكەرە پاڵەوانێك سەبارەت بە منداڵەكانمان، بەشێوازێكی باشو شایستە باسم بكەو ئەو شتە جوانانەی دەیانكەم وەبیریان بهێنەرەوە، تەنها لە كەمو كورتییەكانم مەدوێ.

نورمان (٦٧) ساڵ/ جیابوونەوە پاش (٢٢) ساڵ هاوسەرگیری.

هەروەك چەندین جار بۆ منداڵەكانمانی دەڵێمەوە: خۆشـــم دەوێنو شـــانازیتان پێوە دەكـــەم، منیش بە هەمان شـــێوە پێویســـتم بە بیســـتنی ئەو دەربڕینانەیە لە تۆوە، پێم بڵێی: خۆشـــم دەوێیت، وەك هاوســـەرو باوك شانازیت پێوەدەكەم.

ئەلێكس (٣٧) ســـاڵ، (١٢) ساڵە چۆتە نێو كەژاوەی هاوسەرێتی.

تۆ كاتێك دەڵێیت: شانازیت پێوە دەكەم، پاڵنەرێكی بەهێزم پێدەبەخشی، بە تایبەتی لە كاتێكدا كە سەرزەنشتی خۆم دەكەمو هەست بـــە توڕەییو ناڕەزایی دەكەم لەبەرئەوەی كە وەك (بیڵ گیتس) نیم.

جول (٤٥) ساڵ/ (٥) ساڵە هاوسەرداره.

پیاو بـــەردەوام پێویســـتی بە بیســـتنی وشـــەكانی (ئیعجـــاب)و رێزلێنـــان هەیە، ئەو هەندێ لەو وشـــانە لە كارەكەیدا دەبیســـتێ، هەروەهـــا لـــە كەســـانی تـــرەوە، بـــەڵام زۆر پەرۆشـــی بیســـتنی ئەو جۆرە وشـــانەیە لە هاوسەرەكەیەوە.

دیف (٣٩) ساڵ/ یەك ساڵە چۆتە ژیانی هاوسەرییەوە.

هەمیشـــە ســـوور بە لەســـەر رێزگرتنی هاوســـەرەكەت ســـەرەڕای ناتـــەواویو كـــەمو كورتییەكانی (كە تۆ زیاترو باشتر دەیانزانیت لە هەر كەسێكی تر) با وا هەست بكات كە تۆ بە كەســـێكی مەزنو باش دەیبینیتو هەموو خۆشەویستیو ئیعجابی خۆتی دەخەیتە پاڵ.

دەیڤـــد (٤٩) ســـاڵ/ (٢٦) ســـاڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە.

وەك هاوســـەرەكەم بەبـــێ ســـكاڵاكردن رەزامەنـــدی دەنوێنـــێ بەرامبەر ئەو بیرۆكە نامۆیانـــەی كە لە مـــاوەی پەنجا ســـاڵدا بە بەردەوامـــی خاوەنیـــان بووم، بە شـــێوازێك رەفتار دەكات وەك بڵێی هەندێ خۆشـــی تیا بـــەدی دەكات، هەرچەنـــدە هـــاوڕام نییە لە هەندێ كات، یان گرنگی زۆر بەو شتانە نادات كە من دەیانكەم، بەڵام هەمیشـــە راشـــكاوانە پێم دەڵێ كە عاشـــقمە، ئەوەش شـــتێكی زۆر باشە.

باتریك (٧١) ســـاڵ (٥٠) ســـاڵە چۆتە نێو ژیانـــی هاوســـەرییەوە، ئاگاداربـــە لەوەی كە ببیتە رێنیشـــاندەرم، هەمیشە لەگەڵم بیتو پیشـــتیوانم بیـــت، ئەگـــەر هەڵە بـــووم لەو رایەی كە هەمە، هەوڵ بدە دەستم بگریت تا دەگەیتە ئەو بۆچوونەی كە دروســـتە، هەوڵ مـــەدە لۆمەو سەرزەنشـــتم بكەیـــتو بەرەو هەڵدێر پاڵنەرم بیت.

# چۆن دەبیتە هاوسەرێکی نموونەیی؟

## بۆ پیاوان

(جی نیس سۆلت)

بەشی یەکەم

یەکێك لە خاڵە نایابەکانی هاوسەرگیری ئەوەیە کە ئەگەر چیدی هاوسەرەکەت خۆش نەویست، یا هاوسەرەکەت چیدی خۆشەویستی تۆی نەویست، ئەوا هاوسەرگیری هەر پێکەوەتان دەهێڵێ، تا جارێکی تر سەرلەنوێ بکەونەوە نێوداوی خۆشەویستی یەکتر·(جودیپ فیرۆست) پێشەکی:

گەر ویستت ئامۆژگاری پێشکەش بە پیاو بکەی بۆ ئەوەی ببێتە هاوسەرێکی نموونەیی چی پێ دەڵێیت؟

ئەم پرسیارەم خستە بەردەم زێتر لە هەزار ئافرەتی هاوسەردارو تەڵاقدراوو بێوەژن، هەموو ئامۆژگاری خۆیان پێشکەش کرد بەبێ بەرامبەر، سەرەنجام کۆمەڵێکی زۆر ئامۆژگاری نایاب بوو، کە تیایدا ژنانی هاوسەر توێشووی شارەزایی ژیانیان پێشکەش دەکەن، ئەویش بۆ ئەوەی کە پیاوان بزانن هاوسەرەکانیان حەزیان لەچییەو شەیدای چین، لە ڕێی ئەم ئامۆژگارییانەوە ژنان بە هاوسەرەکانیان دەڵێن تەماشا، ئەمە ئەوەیە کە بەڕاستی پێویستمانە، بە تەواوی وەکو ئەوەی کە ئەو ژنەی لە لاپەڕە···· پێت دەڵێت: ······ ·

دەتوانم بە دڵنیاییەوە جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە، کە ئەم بابەتەی ئێستا لەبەر دەستتدایە، هۆکارێکی یارمەتیدەرو پردێکی باشە بۆ گفتوگۆو لێکگەیشتن، دەبینیت چۆن دەستی هاوسەرەکەت دەگریت بەرەو قوڵایی تێگەیشتنو هاوسەر گیرییەکی سەرکەوتوو·

هاوکات ئەم بابەتە ڕێبەرەو نامیلکەی هاوڕێ (چۆن دەبیتە ژنە هاوسەرێکی نموونەیی) چەند ئامۆژگارییەك پیاوانی خاوەن شارەزاو بە ئەزموون پێشکەشی دەکەن·

بۆ ئەو کەسانەش زۆر گرنگە کە نزیکن لە پەیوەندی هاوسەرگیرییەوە·

ئەم بابەتە زۆر گرنگە، لەهەمان کاتدا زۆر شتی پڕ بایەخ دەخاتە سەر مەڵۆی هەر پەیوەندییەکی هاوسەری یاخود بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت بچنە نێو کەژاوەی ژینی هاوسەرێتییەوە· بەڵکو زۆر هۆکاری گرنگی سەرکەوتنی پێش کەش بە ژینی هاوسەرێتی من کرد (هەرچەندە ئەو هاوسەر گیرییە هەر لە سەرەتاوە زۆر نایابو ناوازە بوو پێش دەرچوونی ئەم کتێبانە)· جیە· ئێس· سۆڵت·

هەوڵ بدە بەشداریم بکەی لە بیرو بۆچونەکانتو ئەو شتانەی جێگای ترسن بۆت، وام لێ بکە منیش وەکو تۆ وا بکەم·

لیسلی (٥١) ساڵ، (٣٠) ساڵە هاوسەردارە، هەوڵ بدە بەردەوام بە گرنگییەوە گوێبیستی قسەی هاوسەرەکەت بیت، هەرچەندە یا قسەکەی خۆش نەبێتو ببێتە هۆی بێزارکردنت، چونکە لای ئەو زۆر گرنگە، گەر بەلایەوە گرنگ نەبوایە تۆی بەشدار نەدەکرد بۆ بیستنی·

باربرا (٦٣) ساڵ/ (١٢) ساڵە هاوسەردارە، کاتێك بە ڕۆژێکی سەختدا تێدەپەڕم، زۆر سکاڵا دەکەم، تکات لێ دەکەم تەنها گوێ بگری بۆ ئەوەی کە دەیلێم، ئامۆژگاریم ئاراستە مەکە سەبارەت بە چۆنیەتی چاککردنی کاروبارو هەنگاو بەرەو باشتر، ئەوەی من لە تۆی چاوەڕوان دەکەم تەنها ئەوەیە کە «گوزارشم لە خۆشەویستی خۆت بۆ بکەی، لە ئامێزی خۆتم بگری»·

بیکی (٣٣) ساڵ، (١٢) ساڵە هاوسەردارە، بەتەواوی درك بەوە دەکەم کە تۆ دەتەوێت یارمەتیم بدەی، بەڵام تکات لێ دەکەم چارەسەری کێشەم مەخەرە بەردەم، تا لێ دەبمەوە لە باسکردنی گرفتەکەم، چونکە ئەوەی هەندێجار، زۆر پێوسیتم پێیەتی تەنها گوێڕایەڵیو دلۆڤانە·

لیندای تەمەن (٤٠) ساڵ، (١٥) ساڵو نیوە هاوسەردارە، هەوڵ بدە بە ڕۆژ پەیوەندیم پێوە بکەی، تا بزانم تۆ هەردەم منت لە یادە، ئەمە کارێکی ساناو ئاسانە، وەلێ بۆ من زۆر دەگەیەنێت·

فیکتۆریای تەمەن (٣٠) ساڵ، وتەکانت ڕۆژانە لە ڕێی ئیمەیڵەوە بەس نییە بۆ من، چونکە من پێویستم بەوەیە جاروبار گوێبیستی دەنگت بم·

جیسیکای تەمەن (٢٧) ساڵان، (٢) ساڵو نیوە هاوسەردارە، بەردەوام پرسیاری لێ بکە بزانە بارودۆخی چۆنە؟ هەست بەچی دەکات؟ گوێبیستی بە، بە دڵت نەك تەنها بە (عەقڵت)!

ماجی (٤٢) ساڵ، دووەم هاوسەری کە (١٣) ساڵە بەردەوامە، بەردەوام پەیوەندی بە هاوسەرەکەتەوە بکە، بۆ ئەوەی پێی رابگەیەنی کە تۆ درەنگ دەگەڕێیتەوە ماڵەوە، بەم شێوەیە نیگەرانیو دڵە ڕاوکە نابێتو لێت تووڕە نابێت·

فیلیس (٤٢) ساڵ، (٢١) ساڵە هاوسەردارە،

بیربکەرەوە لەو وتەیەی دەتەوێت بیڵێی پێش ئەوەی لەزارت بێتە دەر، چونکە هەندێك وتە جاری وا هەیە، هەستی مرۆ بریندار دەکاتو ئازاری دەدات·

جینی (٥٥) ساڵ، (٧) ساڵە تەڵاقدراوە دوای (٢٢) ساڵ هاوسەرداری، ئەگەر کارێکی نێگەتیڤت تێدا بینیم، بەرامبەر بەوە دەیان کاری پۆزەتیڤی منت بێتەوە بیر، ئەوەش بزانە کە بۆ چوونەکانت سەبارەت بە منو ئەوەی لە بارەی منەوە دەیلێی، ورەم بەرزتر دەکاتو زێتر وام لێ دەکات متمانەم بە خۆم بێت!

بۆیە تکات لێ دەکەم، ئەوەی دەتەوێت بیڵێیت زۆر بە وردی گوڵ بژێری بکە·

جینیتا (٢) ساڵە هاوسەردارە، کاتێك هەست بە بێزاری دەکەیت سەبارەت بە من یا منداڵەکان، تکام وایە بە یەکەوە دابنیشینو ئەوەی کە دەبێتە مایەی ناڕەحەتیت بۆم ڕوون بکەیتەوە، تکایە هەستت مەشارەوەو بە تووڕەییو دەستەوەستان هەستی خۆت رووپۆش مەکە، بەڵکو بە ڕاشکاوی ئەوەی لە زەینتدایە پێم بڵێ، تا لە بۆچونەکەت حاڵی بم·



# جەژنتان پیرۆز بێت

شێخانی

پێش ماڵاوایی جەژنتان پیرۆز هەموو ساتەکانی ژیانتان جەژن بێتو هەموو چرکەیەکی تەمەنتان پڕ لە خۆشیو شادیو زەردەخەنەی کامەرانی بێت.

جەژن نوێبوونەوەیە بۆ ژیان، پشوویەکە بۆ رۆح، ژوانێکە بۆ نوێکردنەوەی پەیمانی خۆشەویستیو برایەتیو پێکەوە ژیانی مرۆڤەکانو ئاوڕدانەوەیەك لە یەکتری، دوور کەوتنەوە لە جەنجاڵی ژیانو هەموو ئەو سەرئێشانەی کە مرۆڤ خۆی توشی خۆی کردووە!!

جەژن ساتێکە بۆ هێمنیو ئارامیو گەردن ئازادیو پاك بوونەوەی دڵەکان.

دیمەنێکە رازاوە بەخەندەو پێکەنینو هاوکاریو هاوبەشیو هاوهەستی لە بەخشینی خۆشەویستیو شادمانی.

لە جەژندا مرۆڤەکان بەگەرمی یادیان دەکەوێتەوە کە مرۆڤنو دەبێت وەکو مرۆڤ رەفتاربکەن!

لە جەژندا مرۆڤەکان تێدەگەن کە بە یەکەوە دەتوانن جەژن بکەنو شادمان بنو پڕ بەدڵیان پێ بکەنن! چما کەس دەتوانێ بە تەنێ جەژن بکاتو کەیف خۆش بێت.

لەم رۆژەدا هەست دەکەین کە پەنجە بچکۆلەکانو دەستە لەرزیوەکانو هەژارە بێنازەکانیش مافی خۆشیو رابواردنو شادمانیان هەیە.

لەم رۆژەدا دڵەکان نەرمونیان و دەستەکان بەخشندەو مرۆڤەکان میهرەبانن!

ئەی ناکرێت ئێمە هەمیشە لە جەژندا بینو جیهان بکەینە بە هەشتۆکەیەکی بچوكو هەروەکو چۆن لە جەژندا، هەژارو دەوڵەمەند پیرو لاو کیژو کوڕو منداڵو گەورە هەموو پۆشتەو پەرداخو بێ گرفتنو وا نیشان دەدەن کە هەموو لەناو نازو نیعمەتدا بە هاوبەشیو برایانە ژیان دەگوزەرێنن.

چی دەبوو ئەگەر ئێمە رۆژانە، ئەو پاروانەی لێمان زیادنو دەبنە کۆلیسترۆڵ و دوایی دەبێت بە زەحمەت لە کۆڵی خۆمانیان بکەینەوە، ئەو جلوبەرگانەی لێمان زیادنو نازانین چیان لێ بکەین، ئەو هەموو شتو مەکەی کەڵەکەمان کردوون، بیبەخشین بە هەژارانو هەموومان بە یەکەوە هەمیشە لە جەژندا بین.

دەبا ئێمەش تەنها بیر لە خۆمان نەکەینەوەو هەمیشە لەبیری خۆماندا نەبینو هەست بە بوونی دەوروبەرمان بکەینو ئەوەش بزانین کە بە هاوکاریو یارمەتیدانی کەسانی دی هەر زەرەر ناکەین، بەڵکو زۆر شادمانو ئاسودەو دڵ ئارام دەبین.

غاندی لە یەکێك لە گەشتەکانیدا کاتێك لە شەمەندەفەرێکی کراوەدا بە رێگادا دەڕۆیشتن تاکێك لە پێڵاوەکانی کەوتە خوارەوە، خێرا تاکەکەی تریشی داکەندو بە پەلە لە نزیك ئەوەی تر فڕێیدا، سەرنشینەکانی هاودەمی بە لایانەوە سەیربوو کە غاندی بۆچی وای کرد! پێیان گوت: بۆچی تاکەکەی تریشت فڕێ دا؟!

ئەویش لە وەڵامدا گوتی: بۆئەوەی کاتێك هەژارێك تاکی پێڵاوەکەم دەدۆزێتەوە بتوانێت سوودی لێ وەربگرێت، چونکە ناتوانێت بە تەنها سوود لە یەك تاك وەربگرێت، بۆیە منیش خێرا تاکەکەی تریشم فڕێ دایە خوارەوە.

خۆ ئەگەر ئەو تاکە پێڵاوە بە تەنهاش لای من بمایاتەوە، من هیچ سوودێکم لێ وەرنەدەگرت، بەڵام ئێستا شادمانم کە دەزانم ئەگەر هەژارێك بیدۆزێتەوە سوودی لێ وەردەگرێت!

گرنگ ئەوەیە کەسێك سوودمەند دەبێت جا من بم یان کەسێکی تر!!

هەموو ساتێکی ژیانتان هەر جەژن بێتو هەرشاد بن.